سید عبدالله

زنجیرەی وتەیەک لە زێر

٣

# "وتە و ئامۆژگاری و ژیاننامەی
# حەسەنی بەصری"



وەرگێڕانی بە دەستکارییەوە

حسین ملا قادر پێنجوێنی

گەشە

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: وتەو ئامۆژگاریو ژیاننامەی

حەسەنی بەصری

ئامادەکردنی: سید عبدالله

وەرگێڕانی: م. حسین مەلا قادر پێنجوێنی

تایپ: ئیحسان ئەحمەد.

چاپخانە: چوارچوا

بابەت: وتەو پەند

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠١٨.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی(١٠١٣)ی ساڵی (٢٠١٨) ی پێدراوە.



کتێبخانەی گەشە- سلێمانی- بازاڕی ڕاپەڕین

٠٧٤٨ ١٢٣ ٩٩ ٣٣ یان ٠٧٥٠ ١٢١ ٤٧ ٧٣

## پێشکەش بە:

* ئامۆژگاری کاری ئومەتی ئیسلامی پێغەمبەری سەروەرمانﷺ ، وە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی .

* بە گیانی دایك و باوکم کە هەردەم بە ئامۆژگاریەکانیان ڕێنماییان دەکردم بۆ چاکە کردن .

* بەسەرجەم جگەر گۆشە و نەوەکانم..

* بە براو خوشکەکانم.

* بە هاوسەری ژیانم حاجی محبوبە.

* بەسەرجەم قوتابییەکانم کەلەدنیادا روناکی چاومن و، ئاسودەیی دەرونمن، ئومێدی رۆژی قیامەتن.

## پێشەکی پەخشکار

تەنها بەناوی خوا

گومانی تێدا نییە کە پیرۆزترین و گەورەترین وتە، وتەی خودای بالادەستە (جلَّ جلالە)، پاشانیش وتەی پێغەمبەری سەروەر ﷺ، بەلام ئەی لەدوای وتەی پێغەمبەری سەروەر ﷺ کام وتە پیرۆز و گەورەیە؟!

گومانی تێدا نییە کە وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و، ئەوانەی لەسەر ڕچە و ڕێبازی ئەوان ڕێیان بەڕێ کردووە لە بانگخوازانی ڕاستەقینە و ڕاستگۆ و زانایانی دڵسۆز، ئەوە پیرۆزترین و گەورەترین وتەیە.

ئەوەتا ئەمڕۆ ئێمە لاوانمان دەبینی شانازی دەکەن بەوەوە کە بەشێك لەگۆرانیەکی تایبەتی یان عیبارەتێکی گاڵتەئامێز لە فیلمێك لەبەردەکەن.. دەی لە ڕاستیدا لەجیاتی ئەوە زۆر زۆر پێویستە کە لاوەکانمان وتەو ئامۆژگاریەکانی پێشینانی ئەم ئوممەتی ئیسلامە تێبگەن و لەبەری بکەن..

چونکە بەڕاستی ئەو وتە و ئامۆژگاریانە دڵ نەرم دەکەنەوە و، ژیری (العقل) ڕووناك دەکەنەوە و، هیمەت و تواناکان بڵند دەکەن و دەخەنەگەڕ و بەندەکان هاندەدەن بۆ کارکردن.

بەهۆی ئەوانەوە بڕوادار باوەڕی زیاد دەکات و گەشە دەسێنێت، هەروەها بە تێگەشتن لێیان تەمەڵ و کەمتەرخەم لە بازنەی تەمەڵی و کەمتەرخەمی دەگوێزرێتەوە بۆ بازنەی کارکردن و خوداپەرستی کردن.

لەخودای باڵادەست دەخوازین کە هەمووومان سودمەند بکات بەوتە و ئامۆژگاریانە و بیانکاتە هۆی گەیشتنمان بەڕەزامەندی خۆی... بێگومان ئەو باشترین سەرپەرشتکار و باشترین هاریکارە.

پەخشکار

## پێشەکی وەرگێڕ

پاش وەرگێڕانی هەندێك لە وتە زێڕینەکانی جێ نشینی دادپەروەر (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خوا لێی ڕازی بێت) لە ئامادەکردن و ڕێکخستنی ((سەید عەبدوڵا))، برای ئازیزم کاك (مەریوان تەکیەیی)) ئەم نامیلکەیەشی (كلامٌ منَ الذَّهب) ـ للحسن البصري ـ کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ((سەید عبدالله)ی ڕادەست کردم، تا وەریبگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، پاش سەرنجدانی، بینیم پێویست بەوە دەکات بەدوای سەرچاوەی تردا بگەڕێم تاببێتە خۆراکێکی ڕۆحی و پەروەردەیی باش و تۆکمە بۆ خوێنەری کوردی ئازیز، سوپاس بۆ خودا لەڕێگای برایانی ئازیز د. سەردار ڕەشید پێنجوێنی و مامۆستا سامالّ کۆیکیەوە، ئەم سێ پەڕاوەیان لە ئەنتەرنێتەوە بۆ ڕاکێشام:

١) وقفات و مواعظ من حياة الحسن البصري ـ نوسینی: (أمير بن محمد الدوي).

٢) معالم في التربية والدعوة ـ مواعظ الامام الحسن البصري ـ ٢١ — ١١٠ هـ، جمع و ترتيب: صالح أحمد الشامي.

٣) وَصايا الامام الحسن البصري ـ لإهل القرآن ـ جمع و ترتيب: ((أبو عبدالله حمزه النَّايلي)).

منیش پاش خوێندنەوە و سەرنجدانی هەموویان، هەوڵم دا لە هەریەکەیان ئەوەی پێویستە و لەدووبارە بوونەوە بە دوورە وەربگێڕمە

سەر زمانی کوردیو بیخەمە سەر خەرمانی یەکەم کتێب، بە ئومێدی ئەوەی هاوزمانانم لە ڕووی ڕۆحی و پەروەردەییەوە لێی سوودمەند بن‌و، رچە و ڕێبازی ئەو زانا دانایە بگرنەبەر، هەروەها کەلێنێکی بچووکیش لە پەڕاوخانەی کوردیدا پڕبکاتەوە. لەخودای باڵادەست دەخوازم هاریکاریمان بێت تا لە ژیاندا لەسەر ڕێبازی ئەو زاتە و، بەپێی ئامۆژگاریەکانی ڕێ بەڕێ بکەین، بۆئەوەی سەرئەنجام جێگەی ڕەزامەندی خۆی بین.

لەکۆتاییدا لەخوێنەران دەخوازم لەکاتی خوێندنەوەدا هەر هەڵەو ناتەواویەکیان بەرچاوکەوت ئاگادارم بکەنەوە لێی.

خودایە داوات لێ دەکەم بە فەزڵ و میهرەبانی خۆت کارەکەم بۆ خۆت لێ پەسەند بکەیت و، لەکەم و کوڕیەکانم ببوریت، چونکە فەزڵ و گەورەیی و بەخشندەیی هەر شایستەی خۆتە.

وەرگێڕ

م.حسن ملا قادر پێنجوێنی

سلێمانی، یاڵەکەی خەبات.

## کورتەیەک لە ژیانی

پێشەوا حەسەنی بەسری، یان وەك پێی وتراوە گەورەی شوێنکەوتووان، لەبەناوبانگترین متمانەپێکراوەکان بووە و بەڵگەی (حُجە) خودای باڵادەست بووە لەسەر بەندەکانی لە خوداپەرستی و، دونیا نەویستی خۆپارێزیو دڵ نەرمیدا، هەروەها تاقانەبووە لە زانینی ئەحکامە شەرعیەکان و وانە وتنەوە و ئامۆژگاری کردن و زانستی فەرموودەدا..

**لەدایکبوون و ژینگەی گەشەکردن و پەروەردەی:**

سەردەم سەردەمی جێنشینیەتی عومەری کوڕی خەتتابە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لە شاری مەدینەدا، یەساری باوکی حەسەن لەوشارەدا بەندەی هاوەڵی پایەبەرزەو بەڕێز (زەیدی کوڕی سابت)ی نووسەری نیگای پێغەمبەری سەروەرە ﷺ، خەیریەی خێزانیشی کەنیزەکی (ئوممو سەلەمەی) دایکی بڕوادارانە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ باوك و دایکی لە هۆزی بەنی نەجار بوون.

پێش کۆتایی جێنشینیەتی عومەری کوڕی خەتتاب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ هەواڵدەرێك هەواڵ دەداتە ((ئوممو سەلەمە))[1] دایکی بڕواداران کە کەنیزەکە بەڕێز و خۆشەویستەکەی ((خەیریە)) کوڕێکی بووە، دایکی بڕواداران بەو هەواڵە دڵی پڕ لە خۆشی و شادی دەبێت و ئەو خۆشیو شادیە لەسەر دەم و چاوی دەردەکەوێت.

هەر خێرا لەدوای بیستنی هەواڵەکە دەنێرێت بەدوای خەیریە تا کۆرپەکەی بۆ بهێنێ، خەیریە کە زۆر بەڕێز و خۆشەویست بوو لای دایکی بڕواداران، دەست بەجێ داواکەی دایکی بڕواداران جێبەجێ دەکات بە کۆرپەکەیەوە دەگاتە خزمەتی.. دایکی بڕواداران بەبینینی منداڵەکە دڵە نەرمەکەی پڕ دەبێت لە خۆشی و شادی خوگری پێوەشی، لەڕاستیدا کۆرپەکەشی جوان و ڕووگەش و درەوشاوە و سەرنج ڕاکێش بوو.

پاشان دایکی بڕواداران ئوممو سەلەمە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لا دەکات بەلای خەیریەوە لێی دەپرسێت کوڕەکەت ناوناوە؟

---

[1] ئوموو سەلەمە ـ خوای لێی ڕازی بێت ـ هندی کچی سوهەیلی ناوبووە، لە تەواوترینی ئافرەتانی عەرەب بووە لە ژیریدا، خاوەنی ڕێز و گەورەیی بووە و، لەخۆگری و ویستدا زۆر بەهێزبووە، لە زانست و زانیاریدا لە دیارترینی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە، لە زۆربەیان زیاتر گێڕەرەوەی فەرموودەبووە، (٣٨٧) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، زیاد لەوانە یەکێك بووە لەو ئافرەتە کەمە ناودارانەی کە لەسەردەمی نەفامیدا نووسینیان نووسیوە.

خەيريە لەوەڵامیدا دەڵێ: نەخێر دایە گیان من ئەوەم بەجێهێشتووە بۆ بەڕێزت.

ئوممو سەلەمە فەرمووی: دەکەوایە لەسەر بەرەکەتی خودا ناوی دەنێین ((حەسەن))، ئەمجا دەستەکانی بڵندکردەوە و بەچاکترین نزا نزای بۆ کرد. دواتر ناردیە خزمەتی هاوەڵان تا نزای خێری بۆ بکەن، هاوەڵی پایەبەرز و بەڕێزی پێغەمبەری سەروەر ﷺ، عومەری کوڕی خەتتاب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ ئەم نزایەی بۆ کرد: ((خوایە شارەزای بکە لە دین دا و لای خەڵك خۆشەویستی بکە)).

بەڵێ بەلەدایکبوونی ((حەسەن)) دڵخۆشی و خۆشنوودی دوو ماڵی پڕ لە بەرەکەتی داپۆشی کە ماڵی ((ئوممو سەلەمە))ی دایکی بڕواداران و ماڵی ((زەیدی کوڕی سابت))ی نووسەری نیگای پێغەمبەری سەروەر بوو ﷺ، ئەوەش لەبەرئەوەی ((یەسار))ی باوکی ((حەسەن)) بەندەیەکی بەڕێز و خۆشەویستی ((زەید)) بوو ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ خەیریەی دایکیشی کەنیزەکی هەر بەڕێز و خۆشەویستی ئوممو سەلەمەبوو بۆیە لەدوولاوە بوو بووە دایکی حەسەن:

یەکەم: ئەوە دایکی بوو لەبەرئەوەی حەسەن یەکێك بوو لە بڕواداران.

دووەم: دایکی بوو لە ڕێگەی شیر پێدانەوە، چونکە کاتێك ((خەیریە))ی دایکی حەسەن بۆ ئەنجامدانی پێویستی یەکانی دایکی بڕواداران بچوایەتەدەرەوە، لەکاتی گریانی بەکوڵی حەسەندا، دایکی

بڕواداران  مەمکەکانی دەخستە سەر دەمی بۆئەوەی ئارام بگرێت و دایکی لەبیربکات، لەئەنجامی زۆر خۆشویستنی، مەمکەکانی شیرێکی خاوێنی بەلەزەتی پڕ بەرەکەتی دەتکانە دەمی، ئەویش دەیمژی و پێی بێدەنگ دەبوو.

پەیوەندی بەهێز لەنێوان دایکانی بڕواداران و، نزیکی ماڵەکانیان لەیەکەوە، زەمینەیەکی باشی ڕەخساندبوو، بۆ ئەو منداڵە بەختیارە، تا بە ئاسانی سەردانی هەموو ماڵەکان بکات و لە هەموو دایکانەوە پەروەردەی جوان وەربگرێت، وە بەپێی ڕێنمایی ئەوان ڕێگەی ڕاست وەربگرێت.. خۆیشی دەڵێت ئەو ماڵە پڕ لەبەرەکەتانە ئاوەدان بوون بە جموجۆڵ و یاریەکانی من.

حەسەنی بەختەوەر ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام بوو لە گەڕان و ئەم دیوو ئەو دیوکردندا لەو ژینگەیە خۆشی و پڕ بەرکەت و بۆنداره دا.. بەردەوام لەو سەرچاوە شیرین و بێگەردانە کە ماڵی دایکانی بڕوادارانی پێ ئاوەدان بوو هەڵی ئەهێنجا و تێر ئاو دەبوو، هەروەها لەسەردەستی گەورە هاوڕێیانی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتەکەیدا فێردەبوو... هەر بەهۆی ئەوەوە گێڕەرەوە بوو لە: عوسمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبی تاڵب و ئەبی موسای ئەشعەری و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و جابری کوڕی عەبدوڵڵا و چەندانی تریش لە هاوەڵانی بەڕێزەوە...

حەسەن زیاتر هۆگربووە بە ((عەلی کوڕی ئەبی تالّیب))ەوە و پێی ڕامابووە، لەوەوە دامەزراوی لەسەر دینەکەی و جوانی و چاکی خوداپەرستی و دونیا نەویستی و، پشت کردنە جوانی و لەزەتە دونیاییەکان فێربووە.. وە زۆر ڕامابووە بە دەربڕینە تیشك بەخش و، داناییە سنور پەڕێن و، وتە گشتگیر و ئامۆژگاریە دڵ هەژێنەکانی، لەوەوە ڕەوشتە بەرزەکان خۆپارێزی و خوداپەرستی ڕاستەقینە فێربووە و لەسەر ڕەوییەی ئەو ڕێی بەڕێ کرد لە دەربڕین و ڕاوێژ و ڕەوان بێژیدا.

حەسەن کاتێك تەمەنی گەشتە چواردە ساڵ و پێی نایە ناو کۆڕی پیاوانەوە، لە خزمەتی باوك و دایکیدا، ویستی خودا وابوو کۆچی کرد لە مەدینەی پیرۆزەوە بۆ شاری بەسرە (بصره)، کەئەو خێزانە بەڕێزە لەوێ نیشتەجێبوون، حەسەن لەوێ لەناو خەڵکیدا ناسرا بە حەسەنی بەسری.

((بەسرە)) لەو ڕۆژگارەدا کە حەسەنی تێدا نیشتەجێ بوو، قەڵایەك بوو لە گەورەترینی قەڵاکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە زانستدا.. مزگەوتە گەورەکەی شەپۆلی دەدا بە کۆمەڵێك لە گەورە هاوەڵان و شوێنکەوتووان کە بەردەوام کۆچیان دەکرد بۆئەوێ... بەو هۆیەوە بازنەی کۆڕەکانی زانست بەهەموو شێوەو بەشە جیاجیاکانیەوە، سەرانسەر بەشەکانی مزگەوتەکەی ئاوەدان کردبووەوە هەتا شوێنی نوێژکردنیش.

حەسەن لەوێ خۆی وابەست کرد بە مزگەوتەوە و، خۆی یەکلاکردەوە بۆ ئامادەبوون لە کۆڕەکاندا بەتایبەتی تر کۆڕی ((عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس)) ـ خوا لەخۆی و باوکی خۆش بێت ـ، کە ناسرابوو بە زانا و خوداناسی ئوممەتی موحەمەد ﷺ لەو زاتەوەفێری لێکدانەوەو ((التفسیر))و فەرموودەو، خوێندنەوەکان ((القراءات)) دەبوو... لەوانە زیاتریش فێری زانستە شەرعیەکان و زمان و ئەدەب هیتریش بوو، هەتا بوویە زانایەکی شەرعزان و گشتگیر و باوەڕپێکراو... بەهۆی ئەوەوە خەڵکی ڕوویان تێدەکرد تا لە زانستە فراوان و زۆرەکەی هەڵبهێنجن و فێربن.

هەروەها گوێیان دەگرت بۆ ئەو پەند و ئامۆژگاریانەی کە دڵە ڕەقەکانی نەرم و نیان دەکردەوە و فرمێسکە قەتیس ماوەکانی هەڵدەڕژاند. بەتامەزرۆیی پەندەکانی ئەویان لەبەردەکرد و لێی ڕادەمان کە ژیریان سەرسام دەکرد... وەشوێنپێی هەڵسوکەوتەکانی ئەویان هەڵدەگرت، لە هەموو شوێنێکی بەسرەدا.

زانست و پەند و ئامۆژگاری و هەڵسوکەوتە ناوازەکانی وایکردبوو خەلیفە و ئەمیرەکان پرسیاری بکەن و شوێن دەنگ و باسی بکەون.

### وەفاتی

حەسەنی بەسری ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ لە شەوی هەینی دا لە سەرەتای مانگی ((ڕەجەب))ی ساڵی سەد و دەی ((١١٠)) کۆچیدا وەڵامی بانگی پەروەردگاری دایەوە و وەفاتی کرد.. کە ڕۆژ بوویەوە و لەناو خەڵکیدا دەنگوباسی وەفاتی بڵاوبوویەوە، بەسرە بەو هەواڵە هاتە لەرزە چۆن لەرزەیەك... کاتێك شۆرا و کفن کرا لەدوای نوێژی هەینی لە مزگەوتی گەورەی بەسرەدا، ئەو مزگەوتەی کە وەك زانا و مامۆستا و بانگخواز بۆ لای خودا زۆربەی ژیانی تیادا بردبووە سەر، نوێژی جەنازەی لەسەر کرا، کە بەڕێکرا بۆ بەخاك سپاردن هەموو خەڵکی شوێن تەرمەکەی کەوتن... بەو هۆیەوە نوێژی عەسر لەو ڕۆژەدا لە مزگەوتی گەورەی بەسرەدا نەکرا، لەبەرئەوەی کەس نەمابوو کە نوێژی تیابکات! چونکە هەموو خەڵکی بەسرە شوێن جەنازەکەی حەسەن کەوتبوون بۆ بەخاك سپاردنی، ئەوە یەکەمجاربوو لە مزگەوتی بەسرەدا فەرزێك نوێژ نەکرێت.

## چۆن باسی حەسەنی بەسری کراوە؟!

١) مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك بە خالیدی کوڕی سەفوانی وت پێناسەی حەسەنی بەسریم بۆ بکە، سەفوان وتی:

بەڕاستی حەسەنی بەسری کەسێکە نهێنیەکانی وەك ئاشکراکانی وایە، واتە: نهێنی و ئاشکرای وەك یەکە، وتەی وەك کرداریەتی.

کاتێك فەرمان بکات بە چاکەیەك خۆی پێشەنگترین و بەکردارترین کەسە پێی. ئەگەر فەرمان بکات بە وازهێنان و نەکردنی خراپە و تاوانێك ئەوە خۆی لە هەموو خەڵکی وازهێنەرترە لەو خراپە و تاوانە و، نەکارکەریەتی.

بەڕاستی بینیومە بێ باك بووە لە خەڵکی و، خۆپارێز بووە لەوەی لەلایان بووە و، هەرگیز چاوی لە دەستی کەس نەبووە، کەچی خەڵکی دەبینم ئاتاجی ئەون و چاویان لە دەست و یارمەتی ئەوە.

مەسلەمە کە گوێبیستی خالید بوو وتی: بەسمە ئەی خالید بەڕاستی حەسەنی بەسریم ناسی، ئەمجا وتی: ((گەلێك چۆن گومڕاو سەرلێشێواو دەبێت وێنەی ئەو پیاوەی تێدا بێت)).

٢) بەڕاستی من ئاوات ئەخوازم بە خەڵکی بەسرە بەوەی زانا و دانای وەك شێخ حەسەنی بەسری و موحەممەدی کوڕی سیرینیان تێدایە. (ئەنەسی کوڕی مالیك)

٣) حەمادی کوڕی لە ئەیوبەوە دەگێڕێتەوە ئاوەها پێناسەی حەسەنی بەسری کردووە:

حەسەنی بەسری کە دەدوا بە وتە گەلێك دەدوا کە وەك دووڕ و مەرجان بوو، گەلێکیشی لەدوای ئەو دەدوان بە وتە گەلێك کە وەك ڕشانەوەبوو کاتێك لە زاریان دەردەچوو..

جا ئەوەی جیاوازی نێوان کەسێکە وتەکانی بەپێی ڕووناکی قورئان سوننەت لەزاری دەردەچێت، وە نێوان کەسێکە وتەکانی بەهەزار حالّ و ناحالّ بەهێلّنجدان وەك ئەوەی بڕشێتەوە لە زاری دەردەچێت.

٤) پێش وەفاتی حەسەن پیاوێك وتی بە ئیبنو سیرین: ((باڵندەیەکم بینی لە خەومدا باشترین و جوانترین چەوێکی[٢] لە مزگەوت هەلگرت و بردی)).

ئیبنو سیرین وتی: ((ئەگەر خەوەکەت ڕاستبێت ئەوە حەسەن مردووە)). زۆری پێ نەچوو هەواڵ هات کە حەسەنی بەسری ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وەفاتی کردووە.

٥) ئەنەسی کوڕی مالیك ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ کاتێك پرسیاری لێکرا دەربارەی مەسەلەیەك ((بابەتێك)) ئاوا پێناسەی حەسەنی بەسری کرد:

---

[٢] چەو لە زیخ گەورەترە و لە بەرد بچووکترە لە ڕووباردایە.

((پرسیاریان کرد لە حەسەنی بەسری... بەڕاستی ئەو بیستی و ئێمەش بیستمان، لە ڕاستیدا ئەو لە بەریکرد کەچی ئێمە لەیادمانکرد)).

٦) پێشەوا قەتادەی کوڕی نوعمان ئاوەها پێناسەی حەسەنی بەسری دەکات:

((هەرگیز دانەنیشتووم لەگەڵ زانا و فەقیهێکدا حەسەنی بەسری فەزڵ و گەورەیی نەبووبێت بەسەریدا، وە زانایان بەگشتی شەرمیان لێدەکرد)).

* * *

وتوويەتی:

ئەی نەوەی ئادەم هەڵمەخەڵەتیٚ بە وتەی ئەوەی دەڵێت:

((مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدایە کە خۆشی دەوێت))

بێگومان هەر کەسێك گەلێك یان کەسانێکی خۆشبوێت شوێن ئاکار و کردارەکانیان دەکەوێت، تۆش وابەست نابیت بەکاروانی چاکەکارانەوە هەتا شوێن پێیان هەڵنەگریت و کاروکردارەکانی ئەوان ئەنجام نەدەیت و، دەست بە ڕێنماییەکانیان نەگریت، هەروەها لەسەر رچە و ڕێباز و سوونەتی ئەوان ڕێ بەڕ نەکەیت و، شەو و ڕۆژ بکەیتەوە و بەردەوام لەسەر بەرنامەکەی ئەوان بیت، سوربیت لەسەر ئەوەی کە یەکێك بیت لەوان وە بەڕاستی ڕێگای ئەوان بگریتەبەرو، لەسەر نەخشە ڕێگای ئەوان بیت، ئەگەر چی لەکارکردنیشدا کەمتەرخەم بیت، چونکە بێگومان گرنگ ئەوەیە کە تۆ لەسەر بەردەوامی بیت و دامەزراوبیت لەسەر ڕێگای ئەوان و بەردەوام لێی لانەدەیت...

ئەی ئەوەتا نابینیت جوەکان و گاورەکان و لادەران و شوێنکەوتووانی ئارەزوو و پێغەمبەرەکانیان خۆشدەوێت کەچی لەگەڵیشیان نین، چونکە بەڕاستی ئەوان لە وتە و کرداردا پێچەوانەی ئەوان هەڵسوکەوت دەکەن و، جگە لە ڕاستە شەقامی ئەوان، رچە و ڕێبازی دیکەیان گرتۆتەبەر، جا بەڕاستی بەهۆی ئەوەوە سەرئەنجامیان ئاگری دۆزەخە پەنا دەگرین بەزاتی ئەڵڵا لەوە.

وتوویەتی:

وتە بەبێ کردار دروست نییە و سەرئەنجامی نابێت..

وتە و کرداریش بەنیەتێکی یەکلاکەرەوە نەبێت بۆ خودا سەرئەنجامی نابێت و دروست نییە.... وتە و کردار و نییەتیش سەرئەنجامی نابێت وەرگیراو نابێت ئەگەر بەپێی سوننەت نەبێت.

وتوویەتی:

نەکەن کۆڕ ببەستن و دانیشن لەگەڵ ئارەزووبازان دا، چونکە بەڕاستی کۆڕبەستن و دانیشتن لەگەڵیاندا دڵەکان دەردەدار دەکات.

وتوویەتی:

سەرنجم دا لە دەست گوشادی بەڕاستی هیچ بنەما و لقێکم بۆ بوونی بەدی نەکرد، جگە لە گومانی باش بردن بە خودای باڵادەست، هەروەها بۆ بنەما لقی دەست قونجاوی و چروکی جگە لە گومانی خراپ بردن بەخودای باڵادەست هیچم شك نەبرد.

وتوویەتی:

باوەڕ، بەتێڕامانو ئاوات خواستن نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا باوەڕ بە جێگیربوونە لە دڵەکاندا و، پشت ڕاستکردنەوەی ئەو جێگیربوونەیە لە دڵدا بەکردارەکان.

**وتوویەتی:**

بڕوادار کار بە خوداپەرستیەکان دەکات و ئەنجامیان دەدات، کەچی هەر لە دڵەڕاوکێ و ترس و بیمدایە، واتە لەنێوان ترس و ئومێددایە ((اَلخوْف والرَّجاء)). بەلاَم خراپەکار لەولاوە کار بەبێ فەرمانی خودا دەکات و تاوانەکان ئەنجام دەدات کەچی بێ باك و دڵنیایە.

**وتوویەتی:**

کەفارەتی لە پاشمله باسکردن ئەوەیە کە داوای لێ بوردن لەخودای میهرەبان بکەیت بۆ ئەو کەسەی غەیبەتتکردووە.

**وتوویەتی:**

هەر کەس پەروەردگاری خۆی ناسی بێگومان خۆشی دەوێت، ئەوەی دونیای ناسی تیایدا دونیانەویست دەبێت و دڵ بە دونیا خۆش ناکات و نایکاتە جێگای هەموو هەست و نەستێکی.

**وتوویەتی:**

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُواْ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ ﴾ البروج.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاو و ژنە بڕوادارەکانیان دا و پاشانیش پەشیمان نەبوونەوە ئەوە بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ، هەروەها سزای ئاگری سوتێنەر.

بڕوانن بۆ ئەو بەخشندەی و دەست گوشادیەی خودای باڵادەست کۆمەڵێك ئازاری دۆستانی ئەویان داوە، لەسەر ئەوە بەئاگری دۆزەخ سزای لەسەر ئەوان داناوە، کەچی پاشانیش بەلێبوردەیی و بەخشندەیی خۆی بانگیان دەکات بۆ پەشیمان بوونەوە و تەوبەکردن.. گەڕانەوەش بۆلای پەروەردگار گشتگیرە بۆ هەر بەندەیەکی باوەڕدار.

**وتوویەتی:**

لە ڕەوشتەکانی بڕوادارە:

بەهێزی لە دیندا، پێداگری لە نەرمونیانیدا، سووربوون لەسەر فێربوونی زانست و زانیاریدا، بەخشین لە حەق و ڕاستیدا، بەردەوامی لە چاکەکاریدا، تێگەیشتن لە باوەڕ و یەقیندا، گەڕان بەدوای ڕۆزی و بژێوی ڕەوادا (حەڵاڵدا).

**وتوویەتی:**

سێ کەس لە غەیبەتکردندا ڕێزیان لێ ناگیرێت، واتە لە پاشملە باسکردنیان ناڕەوا نییە:

- لادەرێك لەدین (فاسق) لادانەکەی ئاشکرا بکات و ڕای بگەیەنێت.
- فەرمانڕەوایەکی ستەمکار.
- خاوەن داهێنەرێك (بدعة)[3] کە داهێنانەکەی ئاشکرابێت.

**وتوویەتی:**

لەگەڵ ئارەزووبازان و ئەهلی گاڵتەجاڕ دامەنیشن و دەمەقاڵەیان لەگەڵ مەکەن و، گوێشیان لێ مەگرن. چونکە بەڕاستی دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسانەو دەمەقاڵەکردنو گوێ گرتن لێیان بەفیڕۆدانی کاتە.

**وتوویەتی:**

ئای لەجوانی ئەو دیدەیەی لە نیوەی شەودا لە خۆشەویستی و لەترسی خودا دەگریو فرمێسك هەڵدەڕێژێت.

**وتوویەتی:**

لە نیشانەی ڕوو وەرگێڕانی خودای باڵادەست لە بەندە، ئەوەیە کە ئەو کەسە بەکارگەلێکەوە خەریك و جەنجاڵ بێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە، ئەوەش ڕسواکردنە لەلایەن خوداوە.

---

[3] داهێنان ((البدعة)) بەپێی ڕای زۆرێك لە زانایان ئەوەیە دژ بێت یان پێچەوانەبێت لەگەڵ بنەماکانی شەریعەتدا و بەڵگەکانیدا.

**وتوویەتی:**

مردووی سبەینێ مردووی ئەمڕۆ بەخاك دەسپێرێت.

**وتوویەتی:**

هەرکەس بڕوا و یەقینی هەبێت بە پاشەکەوت کردن، ئەوەلە بەخشیندا دەست گوشادەو هەرگیز لە بەخشین ناگرێتەوە.

**وتوویەتی:**

ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەم ڕۆژگارەدا بهاتنایەتە لاتان، جگە لە ڕووگەکەتان هیچیان لێ بەدی نەدەکردن .

**وتوویەتی:**

هەر نوێژێك دڵ تیایدا ئامادەنەبێت، بەڕاستی ئەوە خاوەنەکەی خێراتر بەرەو سزا دەبات.

**وتوویەتی:**

حەقیقەتی ڕەوشت جوانی ئەمانەن:

ئەنجامدانی کردارە چاك و جوانەکان.

خۆگرتنەوە لە ئەزیەت و ئازاردان.

ڕووکراوەیی و ڕووخۆشی.

**وتوویەتی:**

گەڕان و هەوڵدانت بەدووی ئەوەدا کە خۆشگوزەرانیت بۆ دابین بکات لە خۆشەویستیت بۆ دونیا نییە.. هەروەها وازهێنانت لە پێویستی و ئاتاجیەك کە وازلێهێنانەکەی پێویستیت بۆ دابین بکات لە دونیا نەویستیت نییە.

نیشانەی خۆشەویستی دونیا لای هەر کەسێك دەرچوونی ترس و بیمی دوارۆژە لەدڵ و دەروونی دا.

**وتوویەتی:**

خاوەنی ڕواڵەتی جوان و قەشەنگ، پێویستە لەسەری کە بەکرداری ناشرین ڕواڵەتە جوانەکەی ناشرین و قیزەون نەکات، هەروەها پێویستە لەسەر کەسی ڕوو ناشیرین، دوو ناشیرین پێکەوە کۆنەکاتەوە[٤]..

شاعیر وتوویەتی:

بەڕاستی و بێگومان ڕواڵەتی جوان و قەشەنگ

ئاتاجە بۆ کردارگەلی چاك و جوان و پەسەند.

**وتوویەتی:**

بەباوەڕێکی دامەزراو نەبێت بەهەشت داواناکرێت...

---

[٤] یانی ناشیرینی ڕواڵەت و کردار...

بەباوەڕێکی دامەزراو نەبێت ڕاکردن لە دۆزەخ نییە...

بە باوەڕێکی دامەزراو نەبێت فەرزەکان ئەنجام نادرێن...

بەباوەڕێکی دامەزراو نەبێت خۆڕاگری لەسەر حەق نابێت...

**وتوویەتی:**

خراپترینی خەڵکی بۆ مردوو کەس و کارەکەیەتی، دەبینی سنوور تێدەپەڕێنن لە گریان بەسەریەوەو ئەنجامدانی ماتەمینی بێ شەرعی، لەگەڵ ئەوەی ئەمانە هەمووی زیانی پێدەگەیەنێت!

کەچی لەولاوە بەلایانەوە قورسە قەرزەکانی بۆ ببژێرنەوە، تا بەوە ئارامگاکەی فێنك بکەنەوە و لەبەندی ڕزگاری بکەن.

**وتوویەتی:**

نیشانەی خۆشەویستی دونیا لای هەر کەسێك، ئەوەیە کە هەموو غەمی هەر تێرکردنی سك و داوێنیەتی، بیرکردنەوە و پەی بردنی بەکاروبار و تێگەیشتنی کەمە..

لە ڕۆژدا بەردەوام دەڵێت تۆ بڵێی شەو دابێت تا تێر بخەوم؟

لە شەودا دەڵێت تۆ بڵێی ڕۆژببێتەوە لە شەو ڕزگارم ببێت تا ڕاببوێرم و گاڵتەجاڕی بکەم و لەگەڵ خەڵکی دابنیشم بۆ سوعبەت کردن و دەربارەی کاروبار و ئەحواڵیان پرسیاریان لێ بکەم!

**وتوویەتی:**

پێدەکەنین‌و دڵمان خۆشە، لەو کاتەشدا نازانین کە خودای باڵادەست سەرنجی هەندێ لە کردارەکانمان دەدات و دەفەرمووێت: هیچ شتێکتان لێ قبوڵ ناکەم، هاوار بۆ تۆ ئەی نەوەی ئادەم.. ئایا توانای جەنگت لەگەڵ خودادا هەیە؟ چونکە ئەوەی لەخودا یاخی بووەو بێ فەرمانی کردووە بەڕاستی ئەوە جەنگی لەگەڵ کردووە، سوێند بەخودا حەفتا کەسم لە موجاهیدینی جەنگی بەدر بینیوە، ئەگەر ئێوە بتانبینیایەن دەتان وت ئەوانە شێتن. خۆ ئەگەر ئەوان چاکانی ئێوەیان ببینیایە دەیان وت: ئەمانە هیچ ڕەوشتێکی ئیمانیان نییە، خۆ ئەگەر خراپانی ئێوەیان ببینیایە ئەوە دەیان وت: ئەوانە باوەڕیان بە ڕۆژی لێپرسینەوە نییە.

**وتوویەتی:**

کاتێك پاڵەوانێکی بینیوە لەسەر پەتێك یاری کردووە وتویەتی: ئائەوە لە هاوەڵانی ئێمە چاکترە، لەبەرئەوەی ئەو دونیا بە دونیا دەخوات، لە کاتێکدا هاوەڵانی ئێمە دونیا بە دین دەخۆن، (واتە بە دین دونیا کۆدەکەنەوە).

**وتوویەتی:**

بەڕاستی بە خزمەتی گەلێك گەیشتین، (یانی هاوەڵان ـ خودا لێیان ڕازی بێت ـ) کەسانی سەردەمی سەروەر ﷺ ئێمە لەچاو ئەوان دزین.

هەروەها بەخزمەتی خەڵکانێك گەیشتووین ئەوان بیست ساڵ لەگەڵ خێزانەکانیاندا لەسەر یەك سەرین نووستوون، لەو کاتەدا ئەوەندە گریاون کە سەرینەکەیان بە فرمێسکەکانیان تەڕکردووە، خێزانەکانیان هەستیان بەوە نەکردووە.

**وتوویەتی:**

کاتێك پرسیاری لێکراوە:

کام جیهادکردن گەورەترە؟

وتوویەتی: بەڕاستی جیهادکردنی ناخ و ئارەزوت.

**وتوویەتی:**

چاکەکاران ئەوانەن گەردیلەیەك ئازار نادەن و، بەزیان گەیاندن و شەڕ و خراپەکاریش ڕازی نابن و نایکەن.

**وتوویەتی:**

شەیتانەکان نەوەی ئیبلیسن لەگەڵ ئەو نەبێت نامرن، جنۆکەکان پێش ئەو دەمرن.

**وتوویەتی:**

کاتێك ڕۆژی ڕەستاخێز بەرپادەبێت، بانگکارێك لەناوجەرگەی عەرشەوە بانگ دەکات: با هەستێتە سەرپێ ئەو کەسەی پاداشتی لەسەر زاتی ئەڵڵا پێویست بووە، بەڕاستی کەس هەڵناسێت جگە لە کەسێك نەبێت کە لەبەرخودا بڕیاری لێبوردنی داوە و ئاشتەوایی ڕاگەیاندووە.

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم... بەپێ یەکانت پێ لەزەوی بدە، دڵنیابە پاش کەمێکی دیکە گۆڕتە، بەڕاستی تۆ بەردەوام وای لە ڕووخاندن و تێکوپێکدانی تەمەنتا، هەر لەو کاتەوەی لەسکی دایکت کەوتویتە خوارەوە...

**وتوویەتی:**

تەماکاری هۆکاری خراپەکاری و خراپکردنی دینە و، خۆپارێزیش هۆکاری چاکەکاری و چاککردنی دینە.

**وتوویەتی:**

ئیبلیس یەك چاوترووکانیش لە فریشتەکان نەبووە.

وتوویەتی:

ئەی نەوەی ئادەم.. ڕۆژ میوانتە، لەبەرئەوە چاکەی لەگەڵ ئەنجامبدە و بەچاکی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکە، چونکە دڵنیابە ئەگەر بەوشێوەیە لەگەڵی جوڵایتەوە، ئەوە بە سوپاسەوە بەجێت دەهێڵێت دەڕوات..

ئەگەر خراپەت لەگەڵ ئەنجامداو بەخراپی لەگەڵی جوڵایتەوە، ئەوە دڵنیابە بەزەمکردنت بەجێت دەهێڵێت و دەڕوات، شەوەکەشت ئاوایە.

وتوویەتی:

ئەگەر کەسێك یەك نوێژی بە ئەنقەست وازلێهێنا و نەیکرد، بەڕاستی ئەوە بۆی نییە بیگێڕێتەوە.

وتوویەتی:

ئەی نەوەی ئادەم، دینەکەت هۆی شکۆمەندیتە، بەڕاستی دینەکەت گۆشت و خوێنەکەتە، ئەگەر بەجوانی پەیڕەوی بکەیت، ئەوە گۆشت و خوێنەکەت بێوەی و سەلامەت دەبێت بۆت، خۆ ئەگەر بەبارەکەی تردابێت و دینەکەت بەجوانی پەیڕەوی نەکرد، ئەوە دڵنیابە ئەوە ئاگرێکە ناکوژێتەوە و برینێکە چاك نابێتەوەو، سزایەکە هەرگیز کۆتایی نایەت و ناخێکە نامرێت.

وتوویەتی:

ئەی نەوەی ئادەم.. بێگومان تۆ بە تەنها خۆت دەمریت، بەتەنها خۆت دەچیتە گۆڕەوە، بەتەنها زیندوو دەکرێیتەوە و، بەتەنها لێ پرسینەوە و حیسابت لەگەڵ دەکرێت، تەنها و تەنها تۆ مەبەستیت و، تۆ داواکراویت.

وتوویەتی:

بەڕاستی تۆ ڕۆژانێکیت، هەر ڕۆژێك دەڕوات و تێدەپەڕێت، ئەوە هەندێك لەتۆ دەڕوات و تێدەپەڕێت.

وتوویەتی:

بەردەوام بەندە لە خێردایە، مادام ئامۆژگاریکار لەناخی خۆیدا بێتو، موحاسەبەکردن لەلای خۆی بێت و خۆی بەهیمەتی خۆی پێی هەڵسێت.

وتوویەتی:

ئەی نەوەی ئادەم.. کاتێك خەڵکت بینی لە خێر و چاکەکردندا ئەوە کێبڕکێیان بکە، خۆ ئەگەر لە شەڕ و خراپەکاریشدا بینیتن ئەوە وازیان لێ بهێنە و چی بۆخۆیان هەژمار دەکەن بابیکەن.

بەڕاستی گەلێکمان بینی فەزڵی ژیانی دونیایان دا بەسەر دوا ڕۆژیاندا، بەهۆی ئەوەوە ڕسوابوون و تیاچوون و ئابڕوویان چوو لە بەرچاوی خەڵکیدا.

**وتوویەتی:**

ئەی برِوادار هەر کەسێك کێبڕکێی کردیت لە دینەکەتدا ئەوە تۆش کێبڕکێی بکە، هەر کەسیش لە دونیاتدا کێبڕکێی کردیت ئەوە فڕێی بدەرە گۆڕیەوە و گوێی مەدەرێ.

**وتوویەتی:**

دەست پێشخەری دەست پێشخەری!!

بەڕاستی ژیان چەند هەناسە یەکە، هەرئەوەندەی نەتهێشت بدرێن و قەدەغەت کردن، هەموو ئەو کردارانەی بەهۆیانەوە لەخودای باڵادەست ـ جلّ جلاله ـ نزیکدەبیتەوە دەپچڕێن و کۆتاییان دێت، ڕەحمەت و میهری خودا لەسەر ئەو کەسە بێت سەرنجی ناخی خۆی دەدات و دەگری و فرمێسك هەڵدەڕژێت لەسەر ژمارەی گوناهەکانی پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ مریم: ٨٤.

واتە: بێگومان ئێمە بە ژماردنێکی ورد (ڕۆژانی تەمەنیان) دەژمێرین.

کۆتا ژمارە.. دەرچوونی نەفستە.

کۆتا ژمارە... دەرچوونی کەسوکارت و خانەوادەکەتە.

کۆتا ژمارە... چوونە ناو گۆڕەکەتە.

**وتوویەتی:**

کار ئەنجامدەر بەبێ زانست و زانیاری وەك ڕێبواری وایە بەبێ ڕێگا.. هەروەها کار ئەنجامدان بەبێ زانست و زانیاری زیاتر لەوەی کارەکە چاك بکات خراپی دەکات.. کەوایە بەدوای زانست و زانیاریدا بگەڕێ، ئەو گەڕانەت زیان بەخواپەرستی ناگەیەنێت. وە بەدوای خوداپەرستی دا بەباشی بگەڕێ و ئەنجامیان بدە، ئەگەر بەپێی زانست و زانیاری بێت تووشی زیان نابیت، چونکە بەڕاستی گەلێکمان بینی بەبێ زانست و زانیاری بەدوای خوداپەرستی کەوتن‌و ئەنجامیان دا، سەرئەنجام بە شیرەکانیان هەڵیان کوتایە سەر ئوممەتی موحەممەد ﷺ، دەی خۆ ئەگەر خواپەرستیان لە ڕووی زانست و زانیاریەوە بووایە، ئەوەیان نەدەکرد.

**وتوویەتی:**

سەرم سوڕماوە لەو کەسەی باوەڕی بەقەدەر هێناوە کەچی دڵتەنگ دەبێت!

سەرم سوڕماوە لەو کەسەی باوەڕی بە مەرگ هەیە کەچی دڵخۆش دەبێت!

وە سەرم سوڕماوە لەو کەسەی دونیا و گێچەڵی دونیا بە دانیشتوانی باش دەزانێت، کەچی پاڵی پێوە دەدات و لێی دڵنیایە.

**وتوویەتی:**

تەوقەکردن دۆستایەتی و خۆشەویستی زیاد دەکات و گەشەی پێدەدات.

**وتوویەتی:**

هەڵگرانی قورئان سێ جۆرن:

١) جۆرێکیان وەك کەسێکە شمەکێك هەڵدەگرێت و لەم شار بۆ ئەو شار ئاڵوگۆڕی پێدەکات تا بەهۆیەوە ئەوەی لای خەڵکە بەدەستی بخات..

٢) جۆری دووەمیان کەسێکە وشەکانی لەبەرکردووە و سنورەکانی بەفیڕۆداوە و، سۆزی فەرمانڕەوایانی بەهۆیەوە بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە و، بەهۆیەوە خۆی بەسەر خەڵکیدا ڕاداوەو نواندووە.

٣) جۆری سێ یەمیان کەسێکە لەبەری کردووەو، ئەوە تیایەتی بەباشی فێری بووەو کاری پێکردووە، بانگخوازبووە بۆیو بەپێی ئەو

خوداپەرستی ئەنجامداوە.. بەڕاستی ئەمەیان چاکترین هەلگری قورئانە.

**وتوویەتی:**

لەگەڵ زیادبوونی چاکیەتی و بۆخودا ڕەخساوی بڕوادار ترس‌و بیمی زیاد دەکات، تا دەگاتە ئەوەی دەڵێت: ڕزگار و سەرفراز نابم!

بەڵام فاسق دەڵێت: خەڵکی وەکو من زۆرن.. خودا هەر لێم دەبورێت، خراپەیەکم لەسەر نییە، چونکە بەڕاستی ڕەحمەتی خودا فراوانەو لێبوردەو میهرەبانە!

تەواوی بکە ئەی لەخۆبایی بوو.. ناڵێیت: بەڕاستی وەیلیش بۆ نوێژکەرانە!

-﴿ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ

وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ الأعراف: ١٥٦ – ١٥٧.

واته: پەروەردگار فەرمووی: سزا و ئازاردانم دووچار هەر کەسێ دەکەم کە بمەوێ وە بەزەیی و ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە جا لەدواییدا ئەو ((بەزەیی و ڕەحمەتەم)) دەنووسم بۆ ئەوانەی پارێزکار و لەخواترسن و زەکات دەدەن، هەروەها بۆ ئەوانەیە کەشوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتوون کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە و ((لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە))، ئەو کە ((پێغەمبەرێکە ئەهلی کیتاب سیفەتی دەزانن)) چونکە بە نوسراوی لایانە لە تەورات و ئینجیلدا کە فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگرییان لێدەکات لە خراپە، شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات وە شتە پیسەکانیان لێ حەرام ((قەدەغە)) دەکات و، بارەقورس و گرانەکانیان لەسەر لادەبات و، ئەوکۆت و زنجیرانەش کە بەسەریانەوە بوون، ئەمجا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو ((پێغەمبەرە)) هێنابێت و ڕێز و قەدریان بۆ دانابێت، یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لێ کردبێت و پەیڕەوی ئەو نوورەیان کردبێت ((کە قورئانە)) کە لەگەڵیدا ڕەوانەکراوەتە خوارەوە ئەوانە هەموو ((کەباسکران)) لە ڕزگاربووانن.

هەروەها ئەی لەخۆبایی بخوێنەرەوە: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ الأعراف: ٥٦.

واتە: بەڕاستی میهرەبانی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە.

ئەی لەخۆبایی بخوێنەرەوە: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ﴾ طە: ٨٢.

واتە: وە بەڕاستی من زۆر لێبوردوم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی ئەنجامدابێت، پاشانیش بەردەوام بوبێت لەسەر ئەو ڕێبازە.

هەروەها ئەی لەخۆبایی بخوێنەرەوە: ﴿فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ غافر: ٧.

واتە: دەی خۆش ببە لەوانەی تەوبەیان کردووە و شوێنی ڕێگای تۆ کەوتوون وە بیانپارێزە لە سزای دۆزەخ.

دەی بەڵام لادەری ((فاسق)) لەخۆبایی.. خۆی دەخڵەتێنێ و فێڵ لەخۆی دەکات.. بەهۆی ئەوەوە کاری دوادەخات و... خودا پەرستیەکانی ئەنجامنادات.. تەمەناش لەخودا دەکات لێی خۆش ببێ وە ڕەحمی پێ بکات!.

**وتوویەتی:**

وامەبە مەڕی شوانەکەت لەتۆ ژیرتربێت..!! یەك هاوار دەیترسێنێتو یەك ئاماژە رای دەبڕێت..

بەڵام تۆ چەندەها لە نیشانەو بەڵگەکانی زاتی ئەڵڵا بە ئاگایان هێنایتەوەو ئاگاداریان کردیتەوەو لە ئاگری دۆزەخ ترساندیتیان کەچی بەڕاستی هەر ناترسیت..

بۆ بەهەشت بانگت دەکەن، کەچی وەك وایە دوێنراو کەسێکی تر بێت جگە لەخۆت...

هەروەها ئەو بەڵگەو نیشانانە ئاگادارت دەکەنەوە لە خەشمی خودا، کەچی تۆ بەڕاستی هەرخۆت ئاڕاستەی خەشمی ئەو دەکەیت..

ئەوەتا مەڕ ئەو ئاژەڵەیە کە ژیری نییە کەچی لە گورگ دەترسێت پەلاماری بداتو کۆتایی بەژیانی بهێنێت.. ئەی تۆ هەژمارکراو لە خاوەن ژیریەکان ئایا نازانیت کە شەیتان گورگی مرۆڤە.. ناترسیت لەوەی کە شەیتان باوەڕەکەت ڕاوبکاتو دڵت بمرێنێتو بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ دۆزەخیاندا بچیتە ناو ئاگری دۆزەخ...

ئەی برام..

ڕانە مەڕ گوێڕایەڵی شوانەکەیان دەکەن لەبەرئەوەی کە بەڕاستی دەزانن بەرەو لەوەڕگایەکی پڕ لەوەڕ دەیانبات، یان لەوە دەیانترسێنێت و ئاگاداریان دەکاتەوە کە بکەونە ناو دۆڵێکی قوڵی بێ ئامان...

ئەی تۆ..!!

لەبەرچی گوێڕایەڵی پەروەردگارت ناکەیت لەکاتێکدا ئەو بانگت دەکات بۆ لەوەڕگاکانی بەهەشت، وە لە دۆڵەکانی ئاگری دۆزەخ ئاگادارت دەکاتەوە و دەتترسێنێت..

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم...

دونیات بە دواڕۆژت بفرۆشە، سەرجەمیان بە دەست دەخەیت و قازانج دەکەیت..

وە نەکەیت دواڕۆژت بە دونیات بفرۆشیت.. چونکە بەڕاستی سەرجەمیان دەدۆڕێنیت.

**وتوویەتی:**

ئەگەر تۆ خەڵکت بینی کێبڕکێ دەکەن لە دونیاو کاروباری دونیاییدا، تۆ لە دواڕۆژ و کاروباری دواڕۆژدا کێبڕکێیان بکە.. چونکە بەڕاستی دونیایان دەڕوات و بەهەدەر دەچێت، بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە دواڕۆژە، کە هەرگیز ناڕوات و کۆتایی نایەت.

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم.. کردارەکەت کردارەکەت!!

ئەوە گۆشت و خوێنەکەتە، چاك سەرنج بدە و بڕوانە لەسەر چ حاڵ و شێوەیەك كارەكانت دەكەیت و ڕووبەڕووی دەبیتەوە، بێگومان کۆمەڵێك نیشانە بۆ پارێزكاران هەیە كە پێی دەناسرێنەوە:

ڕاستگۆیی لە دوان و وتندا، پەیمان بە ئەنجام گەیاندن، ئەنجامدانی پەیوەندی خزمایەتی، بەزەیی هاتنەوە بە لاوازاندا، کەم شانازیکردن و دەمارکردن، چاکە ئەنجامدانی بەردەوام، کەم خۆنواندن لە پێش چاوی خەڵکیدا.. ئەوەش بزانە ڕەوشت جوانی و پەرەپێدانی، مرۆڤ لەخودای باڵادەست نزیك دەكاتەوە.

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم.. بێگومان تۆ لەگەڵ کردارەکانتا ڕووبەڕوویت، چاکە و خراپەی دەکێشرێت، جا کەوایە هیچ شتێك بابچووکیش بێت لە چاکە و خێر بەبێ بەهاو کەم مەزانە، چونکە بەڕاستی کاتێك تۆ شوێنەکەی دەبینیتەوە دڵخۆش و شادت دەکات، هەروەها هیچ شتێك بابچووکیش بێت لە خراپە بەکەم مەزانە، چونکە بەڕاستی کاتێك تۆ شوێنەکەی دەبینیتەوە غەمبارت دەکات و تووشی خراپەت دەکات، یاخوا بەر ڕەحمەت میهری خودا بکەوێت کەسێك بژێوی حەڵاڵ و ڕەوا بەدەست دەخات و بەپێی پێویست لێی خەرج دەکات و، زیادە و ماوەکەشی هەڵدەگرێت بۆ ڕۆژگاری هەژاری و نەبوونی.

وتوویەتی:

بەڕاستی من گەلانێك و کەسانێکم بینیوە هەرگیز بەشتێك لە دونیا دڵخۆش و شاد نەبوون کە بەرەوڕوویان هاتبێت و دەستیان کەوتبێت.. هەروەها غەمبار نەبوون و ئاخیان هەڵنەکێشاوە لەسەر شتێك کە لە دەستیان چووە، یان هەر بەدەستیان نەکەوتووە... دونیا لە بەرچاویاندا بە هەموو شتێکیەوە لەگڵ و خۆڵ بێ بەهاتر بوو.. دەی بەڕاستی ئێستا ئێمە لەچاو ئەوانە ئەبێت لەکوێدابین لەبەرامبەر دونیادا؟!

وتوویەتی:

هەی هاوار هەی هاوار.. دونیا ڕۆشت و، کردارەکان کۆمەڵێك ملوانکەن ماونەتەوە لە گەردنتانا، ئێوە خەڵکی بەڕێ دەکەن و کاتیش ئێوە بەڕێ دەکات، لە ڕاستیدا چاکانی ئێوەی بەخێرایی بەڕێ کرد، دەی ئیتر ئێوە چاوەڕێی چی دەکەن؟ بێگومان بن لەوەی لەدوای قورئان پەڕاوێکی دیکە نییە، هەروەها لەدوای پێغەمبەرەکەتان نێردراوێکی دیکە نییە. ئەی نەوەی ئادەم دونیات بەدواڕۆژت بفرۆشە هەردووکیان بە هەموو شتێکیانەوە قازانج دەکەیت، بەڵام نەکەی دواڕۆژت بەدونیات بفرۆشیت چونکە بەڕاستی هەردووکیان بە هەموو شتێکیانەوە لەدەست دەدەیت.

**وتوویەتی:**

بەڕاستی ڕۆژی دوایی ڕۆژی ئاخ هەڵکێشانە... کەسێك دەبینی ماڵ و سامان کۆدەکاتەوەو لەسەریەکی دەنێت، پاشان دەمرێت و ئەو ماڵ و سامانەی بەجێ دەهێڵێت بۆ کەسێکی دیکە، خودای باڵادەست هاریکاری ئەو کەسە دەکات بەو ماڵ و سامانە چاکە دەکاتو لە بوارە چاکەکاندا خەرجی دەکات.. خاوەن ماڵی بەدبەختی کۆکەرەوەش لەوێ ماڵ و سامانەکەی لەتای ترازوی چاکەی کەسێکی دیکەدا دەبینێتەوە..

**وتوویەتی:**

خەڵکانێك کە لەڕۆژی ڕەستاخێزدا موحاسەبەیان زۆر ئاسانە ئەوانەن لە دونیادا موحاسەبەی ناخی خۆیان دەکەن و لەسەر ویست و کردارەکانیان ڕادەوەستن و هەڵوێستەدەکەن.. جائەگەر ئەوەی ویستیان بیکەن لە ویست و کردارەکانیان بەکەڵکیان هات لەسەری دەڕۆن و بەردەوام دەبن، خۆ ئەگەر بەکەڵکیان نەدەهات ئەوە خۆی لێدەگرنەوە و ئەنجامی نادەن..

لەڕاستیدا موحاسەبە لەسەر ئەو کەسانە قورس دەبێت کە لەدونیادا هەر کارێك دێتە بەردەمیان و بۆیان ڕێدەکەوێت دەیکەنو وەریدەگرن، بەبێ لێکۆڵینەوەو موحاسەبەی ناخی خۆیان لەسەری، ئایا ڕەوایە یان ناڕەوایە، چاکە یان خراپە..

ئەوجا خودای باڵادەست دەبیننەوە مسقاڵە زەڕەکانیشی لەسەر ژمار دەکردوون‌و، ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە:

﴿مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَا﴾

الكهف ـ من الآية: ٤٩.

واتە: ئەم نامە و تیانوسە چییە؟ هیچ کردەوەیەکی بچووك و گەورەی بەجێ نەهێشتووە و تۆماری کردووە!

**وتوویەتی:**

خراپترین دوو هاوەڵێك:

درهەم و دینارن، هەتا جێت دەهێڵن سوودت پێناگەیەنن و لێیان سوودمەند نابیت.

**وتوویەتی:**

بێگومان وادەبێت بڕوادار کتوپڕ ڕووبەڕووی شتێك دەبێتەوە سەری پێی سوڕدەمێنێ، ئەوجا دەڵێت: سوێند بەخودا بەڕاستی من ئارەزووی تۆ دەکەم و بێگومان تۆ لەپێویستی و ئاتاجی منی، بەڵام سوێند بێت بەخودا من هیچ پەیوەندیەکم بەتۆوە نییە، هەی هو هەی هو، نێوان من تۆ.

وادەبێت شتێك لەو شتە زۆری بۆ دێنێت بەهۆی ئەوەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناخی خۆی، ئەوجا دەڵێت: من پێویستم بەوە نییە.. من و ئەوە لەکوێ؟ سوێند بێت بەخودا بەویستی خودا من هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆئەوە.

بێگومان بڕواداران گەلێکن قورئان وابەستی کردوون و کەوتۆتە نێوان ئەوان و نێوان لەناوچوونیان.

بڕوادار لە دونیادا بەندە، هەوڵ دەدات بەردەوام بۆ ئازادکردن و ڕزگارکردنی خۆیو لەهیچ شتێك دڵنیانابێت تا بە خزمەتی خودای باڵادەست دەگات، باش دەزانێت کە بەڕاستی ئەو لەسەر گوێ و چاو و زمان و ئەندامەکانی تری لەشی ڕادەگیرێت و حسابی لەگەڵ دەکرێت.

**وتوویەتی:**

لەگەڵ دڵەکاندا بدوێن، چونکە دڵەکان زوو خاوێن دەبنەوەو بەخێرایی زاخاو وەردەگرن، بەڵام ئاگاداری ناخەکان بن و دایان مرکێنن، چونکە نەفسەکان هەنگاو هەڵدەگرنو لە کێبڕکێ دان بۆ گەیشتن بە شەڕ و خراپە، ئەگەر ڕووبەڕوویان نەبنەوەو لەغاویان نەکەن ئەوە هیچ شتێکتان لە کردارەکانتان بۆ نامێنێتەوە.. کەوایە ئارامبگرن و پێداگربن..

چونکە ئەوە شەوانێکە تۆمار دەکرێت، ئێوەش ڕێبواری ڕێگان لەوانەیە کە هەر سات و ناساتێك یەکێکتان بانگ بکرێت و وەڵام

بداتەوەو لانەکاتەوە، کەوایە وریابن بەو کردارە چاکانەتانەوە بگەڕێنەوە کە لەلاتانە..

بێگومان پەیڕەوی کردن لە دینی خودا خەڵکی هیلاك دەکات، بەڵام دەکەوێتە نێوان ئەوان و نێوان ئارەزووبازیەکانیان.. لەڕاستیشدا ئەوەی ئارام دەگرێت لەسەر حەق و پەیڕەوکردنی ڕاستەقینە و دڵسۆزانە لەسەر دینی خودا کەسێکە فەزڵ و بەهای خۆی زانیوە و ئومێدی دواڕۆژی هەیە.

**وتوویەتی:**

بەڕاستی کەسانێك هەن، بەئومێدی ڕەحمو میهری خودان، هەتا لە دونیا دەردەچن ئاواتی لێبوردن و لێخۆشبوونی خودایان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ کرداری چاکەیان نییە.. هەیانە دەڵێت: بەڕاستی من گومانی خێرم بەزاتی ئەڵڵا هەیە و تکای ڕەحمەتی دەکەم، لە ڕاستیدا ئەو درۆ دەکات، چونکە ئەگەر ئەو گومانی خێری بە خودا ببردایە، کارەچاکەکانی لەبەر ئەو ئەنجامدەدا، هەروەها ئەگەر تکای ڕەحمەتی خودای ببوایە بەکردارە چاکەکانی داوای دەکرد.. گومانی تێدا نییە هەر ڕێبوارێك بەبێ خۆراك و ئاو بچێتە بیابانەوە لەوەیە کە تیابچێت.

وتوویەتی:

بەڕاستی بڕوادار سەرپەرشتیارە بەسەر خودی خۆیدا لەبەر خودای باڵادەست موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات، گومان لەوەدا نییە لێپرسینەوەی ڕۆژی ڕەستاخێز ئاسان و سووکە لەسەر کەسانێك لە دونیادا موحاسەبەی نەفسی خۆیان کردووە، بەڵام ئەو لێپرسینەوە قورس و ناڕەحەتە لەسەر کەسانێك هەر کارێکیان بۆ گونجابێت و بۆ ڕێکەوتبێت بەبێ موحاسەبە و لێکدانەوەی سەر ئەنجامەکەی ئەنجامیان داوە.

وتوویەتی:

ئەنجامدانی دراوسێ یەتی چاك، ئەوەنییە زەرەر و زیان بە دراوسێکەت نەگەیەنی و ئەزیەتی نەدەیت، بەڵکو ئەوەیە کە خۆڕاگربیت لە بەرامبەر زەرەر و زیان و ئەزیەت و ئازارەکانیداو، ئەنجامدانی چاکە بەرامبەر خراپەکانی.

وتوویەتی:

هەرکەس دونیای خۆشویست و بەجوانی لەزەتەکانی دڵخۆش و شادمان بوو، خۆشەویستی دواڕۆژ لەدڵی دەچێتە دەرەوە.

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم...

بێگومان تۆ بەردەوام دێیت و دەچیت بۆ بەدەست خستنی باشترین قازانج، دەی با ویست و هەم و غەمت نەفسی خۆت بێت، چونکە دڵنیابە هەرگیز وێنەو نمونەی ئەو قازانج ناکەیت.

**وتوویەتی:**

کەسی واهەیە گوناهو تاوانی یەك لەدوای یەك ئەنجامدەدات تا وای لێدێت بەهۆی ئەوەوە لە هەستانی شەو بێ بەش دەبێت..

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم.. دڵنیابە تۆ سبەینێ ڕووبەڕووی کردارەکانت دەبیتەوە خێر و شەڕی کێشانە دەکرێت، لەبەرئەوە هیچ شتێك لە خێر و چاکە بەکەم و بێ بەها مەزانە ئەگەر بچووکیش بێت، چونکە بەڕاستی شوێنەکەیت بینیەوە دڵخۆش و شادت دەکات.. هەروەها هیچ شتێکیش لەشەڕ و خراپە بەکەم و بێ بەها مەزانەو سەیر مەکە، چونکە بەڕاستی کە شوێنەکەیت بینیەوە، دڵتەنگ و بێزار و هەراسانت دەکات..

دەستم بە دامانت تۆ و گوناهوتاوانە بچووك و بێ بەهاکان نەکەی نزیکیان بکەویت.

وتوویەتی:

بەڕاستی بڕوادار کە دەی بینیت هەر خەریکی لۆمەی نەفسیەتی:

دەڵێت: مەبەستم لەم وشە و وتەیەم چی یە و چیم دەوێت؟

دەڵێت: مەبەستم لەم خۆراك و پاروەم چی یەو، چیم دەوێت پێی؟

دەڵێت: مەبەستم لە گفتوگۆی ناخی خۆم چی یەو، چیم دەوێت لێی؟

هەر کە دەبینیت بەردەوام لۆمەی ناخی دەکات.

بەڵام خراپەکار و فاجر: ئەو هەر هەنگاو هەڵدەگرێت و کار گەلێك ئەنجام دەدات بەبێ ئەوەی لۆمە و موحاسەبەی ناخی خۆی بکات، تا دەکەوێتە چاڵەکەی، ئەوجا لەو کاتەدا دەڵێت: ئەی هاوار بۆ خۆم.. ئەی هاوار بۆ خۆم و قوڕ بەسەر خۆم.

وتوویەتی:

خۆگرتنەوە و دونیانەویستی لە دونیادا دڵ و جەستە ئاسوودە دەکات.

وتوویەتی:

بەڕاستی دڵەکان دەمرن و دەبوژێنەوە، جا ئەگەر مردن ئەوە لەسەرئەنجامدانی فەرزەکان بیان بوژێننەوە، خۆ ئەگەر زیندوو بەئاگاش بوون ئەو بە ئەنجامدانی سوننەتەکان ئەدەبیان دابدەن.

**وتوویەتی:**

بەڕاستی کەسانێکم بینیوە دونیا لەلایان لەگڵ و خۆڵ بێ بەهاتر بووە، هەروەها کەسانێکیشم بینیوە، کەسێکی وایان تیابووە ئێوارەی کردۆتەوە تەنها بژێویەکی کەمی ئەو ئێوارەیەی بووە، کەچی دەیوت:

نەخێر هەموو ئەوە ناخۆم و ڕەوانەی گەدەمی ناکەم!

بەڵکو هەندێکی تەرخان دەکەم بۆ خودای باڵادەست! ئەوجا دەهات ئەو هێندەی لەبەرخودا دەبەخشی لەکاتێکدا کە خۆی زۆر ئاتاجتربوو لەو کەسەی خواردنەکەی پێ بەخشیبوو!.

**وتوویەتی:**

ئەی بڕوادار.. زمانت بەیادی خوا پاراو بکەو، لە ترسی زاتی ئەڵڵا پێڵوەکانی چاوت بە فرمێسکەکان تەڕو پاراوبکە..

چونکە سوێند بەخودا جێگیربوون نییە جگە لە بەهەشت یان دۆزەخدا.. دڵنیابە مەنزڵگای سێ یەم نییە، جا هەر کەس ڕەحمەتی خودا نەیگرێتەوە سوێند بەزاتی ئەڵڵا ئەوە بەرەو دۆزەخ دەڕوات ..

**وتوویەتی:**

مردن.. مردن..

﴿كُل نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ آل عمران:١٨٥.

واتە: هەموو گیانێکی زیندوو چێژەری مەرگە، یانی دەبێت تام و چێژی مەرگ بکات و بمرێت.

بەڕاستی مردن یەخەی هەموو کەسێك دەگرێتو کاتیشی دیاریکراوە.. ڕاوەستانیشی لەنێوان دوو دەستی خودای باڵادەستدا ڕوون و دیارە لێوەی.. کە بەردەوام غەم و پەژارەی درێژە بکێشێت.

**وتوویەتی:**

ئومێدو ترس دوو کەشتی بڕوادارن. یانی بڕوادار دەبێت بەردەوام لەنێوان ئومێدو ترسدا هەوڵبدات و خوداپەرستیەکانی ئەنجامبدات.

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم..

چۆن دڵەکەت گەشە دەکات و دەگەشێتەوە لە کاتێکدا کە هەموو غەمت لە شتێکی تردا خەریکەو، بە شتێکی دیکەوە جەنجاڵە.

**وتوویەتی:**

کەسی وامەیە لە موسڵمانان کاتێك ساڵێك بەسەریدا تێدەپەڕێت و تیایدا هیچ نارەحەتیەك تووشی نابێت و دەڵێت: چیمان بەسەرهات، ئایا خودا لێمان نارەحەت و زویر بووە و خوا حافیزی لێ کردووین؟!

وتوويەتی:

هەر بەندەیەك لە بەندەكانی خودا بەردەوام یادی مردن لە دڵیدا بێت، ئەوە دونیا لەلای و لەبەرچاویدا بچووك و كەم بایەخ دەبێت.

وتوویەتی:

ئاگات لە دونیا بێت..

چونكە بەڕاستی كەم كەس هەیە لە دەستی ڕزگاری ببێت..

سەرسوڕمان بۆ ئەو كەسە نییە تیاچووە، بەڵكو سەرسوڕمان تیاڕامان بۆ ئەو كەسەیە ڕزگاری بووە.. چونكە بەڕاستی گەر تۆ ڕزگارت ببێت لە دەستی.. ئەوە لە دەست شتێكی گەورە ڕزگارت بووە.. ئەگینا بەڕاستی من بەڕزگاربوت دانانێم...

زیاد لەوەش دونیا هەمووی: سەرەتاو كۆتایشی، هیچ نییە جگە لەوەی كە كەسێك سەرخەوێكی شكاندبێت، جا لە خەوەكەیدا هەندێ شتی بینیبێ لەوەی پێی خۆش بووەو حەزی لێكردووە، ئەمجا بەئاگا هاتبێتەوە.

وتوویەتی:

مردن دونیای ڕسواكردووە، ئیتر هیچ شتێكی لە ژیری بۆ خاوەن ژیری بەجێ نەهێشتووە تا دڵی پێخۆش بكات.

**وتوویەتی:**

**خودای باڵادەست فەرموویەتی:**

**﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ۝٦﴾ العاديات.**

**واتە: بەڕاستی مرۆڤ بەرامبەر پەروەردگاری سپڵە و ناسوپاسە.**

**حەسەن وتویەتی:**

**چونکە نەهامەتی و توشهاتەکان هەژمار دەکات و دەیانلێتەوە، بەڵام بەهرە و ناز و نیعمەتەکان لەبیر دەکات.**

**وتوویەتی:**

ئەی بڕوادار..

هەر کەس کێبڕکێی کردیت لە دینەکەتدا ئەوە کێبڕکێی بکە، هەر کەسیش کێبڕکێی کردیت لە دونیاتا ئەوە ئەو کێبڕکێی فڕێبدەرە گۆڕەکەیەوە و نزیکی مەکەوە.

**وتوویەتی:**

بەردەوام بەڕێزی لەلای خەڵکی، مادام چاوت لە دەستیان نەبێت و هیچیان لە دەست وەرنەگریت، بەڵام ئەگەر ئەوەت کرد دڵنیابە سوکایەتیت پێ دەکەن و دەتبوغزێنن.

وتوویەتی:

ئەی بڕوادار ئاگاداربە.. بێگومان دژایەتی کەسێك دەکرێت گومانی لە دینەکەیدا هەبێت...

وتوویەتی:

بەڕاستی بۆ هەموو ئوممەت و نەتەوەیەك بتێك هەیە.. بتی ئەم ئوممەتەش درهەم و دینارە.

وتوویەتی:

بە هەر ڕەوشتێك ویست و مەبەستتە و دەتەوێت هاوڕێیەتی خەڵك بکە.. دڵنیابە بەو ڕەوشتە هاوڕێ یەتیت دەکەن.

وتوویەتی:

هیچ شتێك نازانین قورستربێت لە ناڕەحەتی ئەنجامدانی خوداپەرستیەکان لە نیوەی شەوداو، بەخشینی ماڵ و دارایی.

وتوویەتی:

لەڕۆژی ڕەستاخێزدا ئەو خەڵکانەی زۆر زۆر حسابکردن لەگەڵیاندا ئاسانە، ئەوانەن لە دونیادا موحاسەبەی ناخی خۆیان دەکەن.

وتوویەتی:

بەردەوام خۆپارێزی وابەستە بە خۆپارێزانەوە، تا وایان لێدێت واز لە زۆرێك لە حەلاڵ و ڕەواکان دەهێنن لە ترسی کەوتنە ناو حەرامەکانەوە.

وتوویەتی:

ئەگەر مامۆستا دادپەروەری‌و یەکسانی ئەنجام نەدات لەنێوان قوتابیەکانیدا ئەوە لە ستەمکاران و ئەنجامدەرانی ستەم تۆمار دەکرێت.

وتوویەتی:

خێر و چاکەکردن ئەهل و کەسی خۆی هەیە و شەڕ و خراپەش ئەهلو کەسی خۆی هەیە، هەر کەسیش شتێك واز لێبهێنێت بەسیەتی، تا یەکێك لەو دوانە نەبێت.

وتوویەتی:

بەڕاستی بەندەی بڕواداری واهەیە بەردەوام وەڕەس و بێتاقەتە و وادەبینرێت، لەبەرئەوەی گوناهو تاوان بەبەردەوامی ئەنجام دەدات.

وتوویەتی:

بەڕاستی بڕوادار لە دونیادا غەریبە.. بەڕسوایی دونیا تێك ناچێت و بێتاقەت نابێت، لە شکۆمەندیشیدا کێبڕکێی خەڵکەکەی ناکات.

**وتوویەتی:**

ئەی بڕوادار..

بە کردارەکانت ئامۆژگاری خەڵك بکە، بە وتەو قسەت ئامۆژگاریان مەکە.

**وتوویەتی:**

هەر کەسێك لەخودا بترسێت، خودا وای لێدەکات هەموو شتێك لێی بترسێت..

هەر کەسێکیش لە خەڵکی بترسێت، خودا وای لێدەکات لە هەموو شتێك بترسێت.

**وتوویەتی:**

بەڕاستی لەلاوازی یەقین و باوەڕتە کاتێك وابزانیت ئەوەی لەدەستی خۆتدایە جێگەی متمانەی زیاترو دڵنیایی زیاترە لەوەی لەدەستی زاتی ئەڵلا دایە.

**وتوویەتی:**

سوێند بەخوا هەر بەندەیەك ئاگر و سزای دۆزەخ بەڕاست بزانێت، دونیای بەو فراوانیە لێ دێتەوەیەك..

دووڕووی هەڵخەڵەتاویش: ئەگەر دۆزەخ لەپشت دیواریشەوە بێت لێی، بەڕاستی نازانێت و پشت ڕاستی ناکاتەوە، تا هێرش دەکاتە سەری و هاشاوڵی بۆ دەهێنێت ئەوجا بەبێ گومان دەیبینێت!.

**وتوویەتی:**

شەرم و بەخشندەیی دوو سیفەتن لە هەر بەندەیەکدا ببن، خودا بەهۆیانەوە پایە بڵندی بەو بەندەیە دەبەخشێت و لەناو خەڵکیدا بەرزی دەکاتەوە.

**وتوویەتی:**

دوو سیفەت هەن ئەگەر لەبەندەی خودادا چاك و شیاو بوون ئەوە سیفەتو خوەکانی تری چاك و شیاو دەبن:

پاڵدان بە ستەمکارەوە و یاخی بوون لە نێو نازو نیعمەتەکاندا.. خودای باڵادەست دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾ هود:١١٣.

واتە: پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن. هەروەها دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِي﴾ طه: ٨١.

واتە: زیادەڕەوی تیامەکەن ئەگیا خەشم و قاری من دەتانگرێتەوە.

**وتوویەتی:**

**ئەی فلاّنە کەس..**

لەسەر خێرو چاکەی دوارۆژ بەردەوامی بدە بە دڵتەنگی، بەڵکو بتگەیەنیتە ئەویَ. هەروەها لە کاتژمێرەکانی تەنیایدا بگری و فرمێسک هەڵڕێژە.. بەڵکو پەروەردگارت سەبرت بکات و ئاگاداربێت بەسەرتا، بەهۆی ئەوەوە بەزەیی بە فرمێسکەکانتا بێتەوەو سەر ئەنجام لەسەرفرازان بیت.

**وتوویەتی:**

بێگومان بڕوادار ڕۆژدەکاتەوە دڵتەنگ و غەمبارە.. شەویش دەکاتەوە هەر دڵتەنگ و غەمبارە.. جا جگە لەوە هیچی تری بۆ نییە..

لەبەرئەوەی لەنێوان دوترس و بیمدایە: لەنێوان گوناهو تاوانێکدا کەبەڕاستی تێپەڕیوە، نازانێت خودای بالاّدەست چی تیا بڕیار دەدات بەرامبەری.. وەلەنێوان داهاتویەکدا کەبەڕاستی ماوەتەوە، نازانێت تیایدا چی تووش دەبێت لە فەوتێنەر و ناڕەحەتی!!

کەوایە ئەی لەخۆبایی لەبیَ ئاگاییت بەخەبەربیَ..

هەروەها بگری لەسەر گوناهو تاوانەکەت..

ئەوەتا ئیبراهیمی خەلیلە ترساوە و.. موسای بگۆیە (کلیم) ترساوەو.. عیسای مەسیحیشە هەر ترساوە.. موحەمەدیش کە

چاکترینی مرۆڤەکان و خاوێنترینی ئەوانەیە پێیان لەزەوی داوە هەر ترساوە! ئیتر ئەبێت من چۆن نەترسم و هاوار نەکەم و نەگریم و فرمێسک هەڵنەڕێژم؟!

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم...

دەستم بە دامانت تۆو ستەمکردن.. چونکە بەڕاستی ستەمکردن تاریکی و شەوە زەنگەکانی ڕۆژی ڕەستاخێزە خەڵکانێك لەڕۆژی ڕەستاخێزدا دێن چاکەکانیان وەك چیایە، بەڵام بەردەوام لێیان وەردەگیرێت هەتا هەیانە دەست بەتاڵ دەمێنێتەوە و بەبێ هیچ چاکەیەك.. پاشان خودا پەنامان بدات لێیان ڕادەکێشرێت بۆ دۆزەخ..!

**وتوویەتی:**

ئەی خەڵکینە.. خۆ ئەگەر جگە لە خۆشەویستی دونیا هیچ گوناهێکی دیکەمان نەبێت، بەسە بۆئەوەی لەخۆمان بترسین...

خودای باڵادەست دەفەرمووێت:

﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْأَخِرَةَ﴾ الأنفال: ٦٧.

واتە: ئایا ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێت ((بەوەرگرتنی فیدیە)) لەکاتێکدا خوای گەورە پاداشتی ڕۆژی دوایی دەوێت بۆ ئێوە.

**وتوویەتی:**

ئەی خەڵکینە.. بەڕاستی کەسێك ئەگەر بەدوای زانست کەوتو زانست خواز بوو، ئەوە بەئاشکرا لەچاو و ویقار هەڵسوکەوتو زمان و دەست و نوێژەکانی و پەیوەندیەکانی و دونیانەویستیدا دەبینرێت.. بەلاّم بەداخەوە ئێستا زانست بووەتە داو.. ئیتر هەمووان یان ڕاودەکرێن پێی یان پێی ڕاودەکرێت.. مەگەر یەکێك پەروەردگارت ڕەحمی پێ بکات، ئەوانەش کەمن.

**وتوویەتی:**

دڵ هەیە گورجوگۆڵانە بۆ پیس و پۆخڵی کاردەکات.. چەندانیش هەیە دەربارەی ئەنجامدانی چاکی و جوانی دەخەوێت..

ئەی نەفس هاوار بۆتۆ چیە ئەوەی ڕازیت دەکات لە دونیای بۆگەندا؟!

بۆ ئێمە باشترە سڕینی فرمێسکەکان، هەروەها غەم و خەفەت دامان بپۆشێت.

بۆ ئێمە باشترە کە بە ئاگابێینەوەو کفن لەبەرکەین..

بۆ ئێمە باشترە کوشتنی ئارەزوو کە لە سینەدا وەك بتی لێهاتووە.

بەڕاستی سەفەرێکی دوور و درێژمان لەبەردەمدایە، جێگیربونی بەدوایدا دێت، جا یان بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، یان بۆ نێو بەهەشتەکان دەچێت.

ئەم ژیانە چیە تاببێتە وێستگەو نیشتمان؟ لەڕاستیدا بۆچی بەچەند ڕەنگ خۆنواندنو فێڵ کردن؟ بۆچی چوونە ناو ئاژاوەکانەوە؟!

بەسیەتی هاوڕێ یەتی ناکەس بەچە.. لەگەڵ ئەملاو ئەولا کردندا لە تەنگەژەو نەهامەتیەکاندا.

تەوبە لە هاودەمی کردنی کەسانێك کە ڕاهاتوون لەسەر بۆگەنکاری.

لەڕۆژگارێکداین پیلان ڕێکدەخرێت بۆ ئەمین و دەست پاك.. برای خیانەتکاریش جێگەی متمانەیە!

تەوبە و دووری لەوانەی خۆدەبەنە پێشەوەو لەسەر دڵ پیسی کاردەکەن بۆ خۆبردنە پێشەوە.

تەوبە لەوانەی دوڕوون، یان ڕووی جوانیان پیس و پۆخڵ کردووە.

تەوبە و دووری لەوەی بەهەشتەکانی فرۆشتووە و لەدەست داوە، لەبەر خاتری سەوزەڵانیەکی کاتی.

## وتوویەتی:

کەسی واهەیە گوناهێك ئەنجام دەدات بەڵام هەرگیز لەبیری ناکات.. بەردەوام یادی دەکاتەوە و لێی دەترسێت هەتا دەچێتە بەهەشت.

**وتوویەتی:**

بەئاگابێرەوە ئەی لەخۆبایی..

دەستبەکار و گورج و گۆڵیت بۆ کاری پیس و پۆخڵ و.. کەچی دەربارەی کاری چاك و جوان لێی دەنوویت.. هەروەها بێ کاری و تەمەڵی دات دەگرێت کاتێك بەخت دەبێتە یاوەرت!!

**وتوویەتی:**

دەربارەی کەسانی یاخی و تاوانکار:

ئەوانە زاتی ئەڵڵایان بێ بەها سەیرکرد، بەهۆی ئەوەوە لە ڕاستیدا لێی یاخی بوون و تاوانیان ئەنجامدا.

خۆ ئەگەر زاتی ئەڵڵایان بە گەورە و بەبەها سەیرکردبایە و شکۆمەندیان بپاراستایە ئەوە بێگومان پارێزراو دەبوون لە یاخی بوون و ئەنجامدانی تاوان.

**وتوویەتی:**

تەوبە لەدەست شوێنکەوتووانی دونیا و داواکارانی بەڕاستی دونیا بێ بەهایە!! سوێند بەخودا بەڕاستی بەنی ئیسرائیلیەکان پاش پەرستنی خودای باڵادەست دەستیان کرد بە پەرستنی بتەکان ئائەوەش بەهۆی خۆشەویستیان بۆ دونیاو شوێنکەوتنی.

**وتوویەتی:**

ئەی بێ ئاگایان بەخەبەربێن.. چونکە بەڕاستی کاروانەکە کەوتۆتە ڕێگەو جوڵاوە.. لەبەرە بەیانیشدا کاروانچیانی کاروانەکە سوپاسی خودا دەکەن لەسەر ئەو شەوڕەوی و بەردەوامییە لە ڕۆشتنندا بەبێ وەستان کە گەیاندنیە هەوا..

﴿ أَفَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا بَيَٰتٗا وَهُمۡ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾﴾ الأعراف.

واتە: ئایا خەڵکی ئەو شار و گوندانە ترسیان نەبوو لەوەی سزای ئێمەیان بۆ بێت لەشەودا کاتێك خەوتوون، وە ئایا خەڵکی ئەو شار و گوندانە ترسیان نەبوو لەوەی کە سزای ئێمەیان بۆ بێت لە چێشتەنگاودا لە کاتێکدا یاری و گاڵتەدەکەن، جا ئایا لە پیلانی خودا نەترسان و بێ باك بوون، دەی کەس لە پیلانی خودا دڵنیا نابێت مەگەر کەسانێك کە زەرەرمەندبن.

**وتوویەتی:**

ئەی برادار.. باش بزانە بەڕاستی تۆ زاتی ئەڵڵات خۆش ناوێت تا گوێڕایەڵی ئەو زۆر نەکەیت.

**وتوویەتی:**

ڕاستیو بنەمای ڕاستەقینەی ڕەوشت جوانی ئەنجامدانی چاکەکانو بەخشینەوەیانە، هەروەها دەست کێشانەوەو وازهێنانە لە ئەزیەت و ئازاردان، لەگەڵ ڕووخۆشی.

**وتوویەتی:**

دونیا نەویست:

دونیا نەویستی ئەوەیە کاتێك کەسێکی دونیا نەویست کەسێك دەبینێت دەڵێت: بەڕاستی ئەو کەسە لە دونیانەویستیدا لەمن باشترە. واتە لە دونیانەویستیدا هەرگیز لەخۆی ڕازی نییەو خۆی لە کەس بە باشتر نازانێت.

**وتوویەتی:**

ئەی نەوەی ئادەم.. ناخت خاوێن بکەوەو بەرز ڕای بگرە، چونکە بەڕاستی تۆ بەردەوام ڕێزدار دەبیت لەلای خەڵكو خەڵکیش بەردەوام ڕێزت دەگرن، مادام چاوت لەوە نەبێت لەدەستی خەڵکدایەو لێیان وەرنەگریت، بەڵام ئەگەر ئەوەت کرد: ئەوە دڵنیابە خەڵکی سوکایەتیت پێدەکەنو ئەت بوغزێنن و بێزیان لە وتەت دێتەوە.

**وتوویەتی:**

بێگومان بڕوادار کە پێویستی یەکی داواکردو بەدواییدا چوو، بۆی گونجاو بەدەستی کەوت، سوپاسی خودای بالادەستی لەسەر دەکات و بەهی ئەوی دەزانێت. خۆ ئەگەر بۆشی نەگونجاو بەدەستی نەکەوت، ئەوە وازی لێ دەهێنێت و خۆی بەدوایدا شەکەت و نارەحەت ناکات.

**وتوویەتی:**

باشترین خانە بۆ بڕوادار دونیایە ئەوەش بێگومان لەبەرئەوەی کاری کەمی تیا ئەنجامدەدات و توێشوی تیا هەڵدەگرێت بۆ بەهەشت...

خراپترین خانەش بۆ بێ باوەڕ و دووڕوو دونیایە، بێگومان لەبەرئەوەی شەو و ڕۆژ تیایدا بەگاڵتە و گەپ بەسەردەبات، توێشوەکەشی تیایدا بۆناو ئاگری دۆزەخە..

﴿ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ١٨٥ ﴾ آل عمران.

واتە: ئەمجا هەر کەس دوورخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە سەرفراز و سەرکەوتووە، ژیانی دونیاش هیچ شتێك نیە جگە لە چەند سات و ئارەزوو و لەزەتێکی فریودەر و کاتی.

**وتوویەتی:**

ئەی ئەو کەسەی بڕوات هێناوە بەردەوامی بدە بەدڵتەنگی و خەم خۆریت لەسەر خێرو چاکەی دوارۆژ، بەڵکو ئەو خەم خۆریەت بتگەیەنێتە ئەوێ.. هەروەها لەساتەکانی تەنهایتدا بگری‌و فرمێسك بڕێژە بەڵکو پەروەردگارت سەرنجت بدات و بەزەیی بە فرمێسکەکانتا بێتەوەو سەرئەنجام لەسەرفرازان و سەرکەوتووان بیت.

**وتوویەتی:**

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی ڕەستاخێزە کە مردن دێتە سەر چاکەکانتان‌و، گوڵبژێریان دەکات، هەروەك چۆن یەکێکتان گوڵبژێری جوانترین‌و باشترینی خورمایەك دەکات لەوەی لەسەر سینی یەکە.

**وتوویەتی:**

سوننەت.. سوننەت

ناخەکان ڕابێنن لەسەر خۆشەویستی سوننەت‌و بەگەورە ڕاگرتنی هەژاران و تامەزرۆیی بۆ پەیڕەوی کردنی، چونکە بەڕاستی هاتووە لە فەرموودەدا:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر، مینبەرەکە هەژا، هەرچۆن پەلێك دەهەژێت بۆ درەختەکەی هەروەها گریا هەروەك گریانی منداڵ!!

ئەی بەندەکانی خودا! دارێك دەهەژێت بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ، وەك تامەزرۆیی و ئارەزوومەندی بۆی! دەی کەوایە تۆ شایستەتر و شایانتری کە ئارەزوومەند و تامەزرۆتر بیت بۆ بەخزمەت گەشتنی.

وتوویەتی:

ئەی بەندەی خوا بزانە بەڕاستی هەنگاوەکانت دوو هەنگاوە:

هەنگاوێك بۆ خۆتەو هەنگاوێکیش لەسەرتە..

جا سەرنج بدە و سەیربکە بۆ کوێ دەڕۆیت؟ وە بۆ کوێ دەگەڕێیتەوە؟

هەروەها ئاگاداری ئارەزووبە، چونکە بەڕاستی خراپترین دەرد کە تێکەڵی دڵ دەبێت ئارەزووە، سووربە لەسەر زانست، باشترین زانستیش خۆپارێزی و پشت بەستنە.

باش بزانە بەندە بەردەوام لەخێردایە، مادام کە وتی، وتنی بۆ خودا بێتو، کاری کرد کارکردنی بۆ خودا بێت..

بزانە کە خۆشەویسترین بەندە بەلای خوداوە ئەوانەن خودا لەلای بەندەکانی خۆشەویست دەکەن‌و، وەك ئامۆژگارێك لەسەر زەویدا کاردەکەن و تێدەکۆشن.

هەروەها ئاگاداری بەرتیل بەو خۆتی لێ دووربگرە، چونکە بەڕاستی کە ئەو لە دەرگاوە هاتەژوورەوە، ئەمانەت لە پەنجەرەوە دەچێتە دەرەوە.

**وتوویەتی:**

هەر کەسێك لەئێوە کە بتوانێت پێشەنگ و پێشەوا بێت بۆکەسانی دیکە، دەبێت کاربکات، واتە بەکردار پێشەنگ و پێشەوابێت بۆ ئەوانەی دوای خۆی، چونکە هیچ شتێك لەتۆ وەرناگیرێت ئەگەر لەو شتەدا بەشێکی خۆتی تێدا نەبێت.

**وتوویەتی:**

بێگومان هەر کەسێك هەوڵی بابەتێك لەزانست بداتو فێری ببێتو لەبەرخودا کاری پێ بکات، بەڕاستی ئەوە بۆ ئەو چاکترە لەوەی کە خاوەنی هەموو دونیا بێت.

**وتوویەتی:**

پشتکردنە کەسانی گەوج و نەفام نزیکبوونەوەیە لە زاتی ئەڵڵا، هەروەها بەردەوامی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی ژیردا دامەزراندنە بۆ دینی خودا، ڕێزگرتنی برِوادار خزمەتکردنە بەخودا، زۆرانبازی و ڕوو بەڕووبوونەوەی کەسی لادەر، یارمەتیو هاریکاریە لەلایەن زاتی خوداوە.

وتوویەتی:

ئەنجامدانی سوننەتەکان و شەو نوێژ بۆ ئێمەومانان نییە..

بەڵکو لەڕاستیدا ئەنجامدانی سوننەتەکانو شەونوێژەکان بۆ کەسێکە فەرزەکانی بەتەواوی ئەنجامداوە.

وتوویەتی:

بێگومان دژایەتی کەسێك دەکرێت کە بەگومان بێت لە دینەکەیدا.

وتوویەتی:

ئەی نەوەی ئادەم.. بزانە تۆ لەنێوان دوو کێشمە کێشمدای هەتا کۆتایی ژیانت و هاتنی دواڕۆژ، ئەو دوانەش: مەترسی شەو و ڕۆژن، ئاگاداربە لە کارت نەخەن، چونکە بەڕاستی سەرئەنجام یان بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخە.. دەی ئیتر دەبێت کێ لەتۆ مەترسی دارتربێت؟!

وتوویەتی:

بێگومان بۆ خێر و چاکەکردن کەسانی شایان بەخێر و چاکەکردن هەیە، بۆ شەڕ و خراپەکردنیش کەسانی شایان بەشەڕ و خراپەکردن هەیە، جا هەرکەس وازی لە شتێك لەو دووانە هێناو دەست بەرداری بوو ئەوە بە سیەتی لەوی دیکەیان هەژماربکرێت..!

**وتوویەتی:**

کەمێك لەدونیا سەرجەنجاڵ و مەشغوڵت دەکات لە دابینکردن و ئەنجامدانی پێویستیەکانی دوارۆژ.

* * *

**پرسیاری لێکراوه:**

نهێنی دونیا نەویستیت چی یە لە دونیادا؟

**وتوویەتی:**

زانیومە بەڕاستی کە ڕۆزی من جگە لەخۆم کەسێکی دیکە وەری ناگرێت، لەبەرئەوە لێی دڵنیابووم..

بەڕاستی زانیومە کە کاری من جگە لەخۆم کەسێکی دیکە پێی هەڵناسێت و ئەنجامی نادات، لەبەرئەوە پێوەی خەریك بووم و خۆم پێوە خەریك کردووە.

وە دڵنیابووم کە خودای باڵادەست ئاگا و چاودێرە بەسەرمەوە، لەبەرئەوە شەرمم کردووە کە بەگوناهو تاوان ڕووبەڕووی بوەستم و بەخزمەتی بگەم..

هەروەها زانیومە کە مردن چاوەڕێم دەکات لەبەرئەوە توێشووم ئامادەکردووە بۆ بەخزمەتگەشتنی زاتی ئەڵڵا.

**پرسیاری لێکراوە:**

ئەی ئەبا سەعید: چ جیهادێك گەورەترینە؟

**وتوویەتی:**

جیهادی ئارەزووەکانت.

**پرسیاری لێکراوە:**

وتیان ئەی حەسەن ڕات چی یە دەربارەی ئەو جەنازەیە واخەڵکی لەسەر کۆبوەتەوە؟

**وتوویەتی:**

چی تانە وا قەرەباڵغیتان کردووە! ئەوە دارەمەیتەکەیەتی لەناو مزگەوتدا، پەلەبکەن بچنە ژێری تا ئێوەش وەك ئەوتان لێ نەهاتووە.

**پرسیاری لێکراوە:**

چ زیندووکردنە و هەستانێکی شەو گەورەترە؟

**وتوویەتی:**

لەنیوەی شەو بەدوواوە، بۆ کەسێك لەسەرەتای شەو خەوێکی بۆ کردبێت، ئیتر لەدوای نیوە شەو کە هەستا بە شەو نوێژ و خوداپەرستی یەوە خەریك بێت تاکۆتایی شەو..

چونکە ئەو کاتە بەڕاستی کاتی دابەزینی ڕەحمەتی خودا و لێخۆشبوونی بەندەکانیەتی.

**پرسیاری لێکراوە:**

لاوێك هاته خزمەتی حەسەن و پێی وت: هەستانی شەو هیلال و بێتاقەتی کردووم ـ واتە هەوڵی زیندووکردنەوە و هەستانی شەوم داوە بەڵام نەم توانیوە– هۆکەی چی یە؟

## وتوویەتی:

لەڕاستیدا گوناهو تاوانەکانت باڵ بەستیانکردوویت و نایەڵن شەو هەستیت و بەخوداپەرستیو زیندووی بکەیتەوە.

## پرسیاری لێکراوە:

پیاوێك پێی وت کۆمەڵێك لەلات دادەنیشن تا بەهۆی ئەو دانیشتنەوە لە خزمەتتا ڕێگایەك بەدی بکەنەوە بۆ تانە لێدانت، واتە بەدوای هەڵەکانتا دەگەڕێن تا شورەیی دارت بکەن توانجت تێبگرن.

## وتوویەتی:

ئەی برا: خوا چاکت بۆ بکات، بەڕاستی من ناخی خۆم ((نفسی)) ژێر بار خستوە تا کار بۆ چوونە بەهەشت بکات ڕاهات و سوربوو لەسەری، هەروەها ڕامهێناو ژێربارم خست تا کار بکات بۆ ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ ڕاهات و سووربوو لەسەری..

بەهەمان شێوە ڕامهێناوە تا وا کاربکات لە خەڵکی سەلامەتو پارێزراو بێت، کەچی بۆ ئەوە هیچ ڕێگایەکم بۆ بەدی نەکراوە، ئەوەتا

خەڵكی لە بەدیهێنەر و ڕۆژیدەرەكەشیان ڕازی نین، ئیتر چۆن لە بەدیهێنراوێكی وەك خۆیان ڕازی دەبن.

## پرسیاری لێكراوە:

كەسێكی تر هاتە لای و پێی وت: من بۆ فەرمانی خودا دەكەم و گوناهو تاوانیش ئەنجام دەدەم، كەچی دەشبینم خودا دونیام بەسەردا دەكاتەوە و هەرپێم دەدات، هەروەها نابینم لە هیچ شتێك بێ بەش بم.

## وتوویەتی:

هەر ئەوەت بەسە كە خودا بەهۆیەوە لە دواندنی خۆی ((مناجاتە)) بێ بەشت بكات.

## پرسیاری لێكراوە:

لە ((حەفصی كوڕی عومەرەوە)) هاتووە وتوویەتی: حەسەن بەكوڵ دەگریا، پێی وترا: چی دەتگریەنێت؟

## وتوویەتی:

دەترسم كە كردارەكانم فڕێم بداتە ناو ئاگری دۆزەخ و بەخەیاڵیشیدا نەیەت.

## پرسیاری لێکراوە:

حەمزەی نابینا ((حمزة الأعمى)) وتی: چوومە خزمەتی حەسەنی بەسری لەماڵی خۆیدا بینیم دەگری، چەند جاری تر بەدوای ئەوەدا دەچوومە خزمەتی وادەبوو دەمبینی نوێژدەکات و لەکاتی نوێژەکەیدا گوێبیستی گریان و هەنسکە هەنسکی بووم..

بۆیە ڕۆژێکیان پێم وت: مامۆستا بەڕاستی تۆ زۆر دەگریت!؟

## وتوویەتی:

ئەی کوڕی خۆم، باوەڕدار ئەگەر نەگری ئەبێت چی بکات؟

ئەی کوڕی خۆم، بەڕاستی گریان بانگخوازە بۆ بەدەستخستنی ڕەحمەتی خودا. جائەگەر دەتوانیت بەدرێژایی تەمەنت بگریت ئەوە خەریك بە بەڵکو خودای باڵادەست ڕەحمت پێ بکات.

ئەمجا وتی: پێمان گەشتووە کە بەڕاستی ئەو کەسەی لەترسی خودا فرمێسکی هەڵدەڕێژێت، لەگەڵ ڕژانی فرمێسکەکەیدا گەردنی لە ئاگر ئازاد دەکرێت.

## پرسیاری لێکراوە:

کەسێك بەحەسەنی وت: بەڕاستی فلاّنە کەس لە پاشملە باسی بەخراپە کردیت، حەسەن هەر لەوێدا تەبەقێك شیرینی بەدیاری بۆ ڕەوانەکرد، ئینجا:

**وتوویەتی:**

ئەی برا:

ئاگادارکرام کە جەنابت چاکەکانی خۆتت بەدیاری بۆ ڕەوانەکردووم، منیش بەم دیاریە بێ بەهایە سوپاسم کردیت و جوبرانی ئەو چاکەتم کردۆتەوە.

**پرسیاری لێکراوە:**

لە عەمروی کوڕی مەیمونی کوڕی مەهرانەوە هاتووە وتوویەتی: پاش ئەوەی باوکم بەساڵاچوو و چاوی لەدەست دا، پێی وتم: هەستە بمبە بۆ خزمەتی حەسەنی بەسری..

لە خزمەتیا چوومە دەرەوە و دەستم گرت و پێشی کەوتم بۆ ماڵی حەسەنی بەسری، کاتێك چووینە خزمەتی باوکم پێی وت: ئەی ئەبا سەعید، بەڕاستی دڵم ڕەقیەك ڕووی تێکردووە و پێوەی گیرۆدەبووم.. جا بۆیە هاتوومەتە خزمەتت چارەیەکم بکەیت و لەو دڵڕەقیە ڕزگارم بکەیت..

**وتوویەتی:**

حەسەن ئەم ئایەتانەی خوێندەوە:

﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ الشعراء.

واته: تۆ پێم بڵێ و سەرنج بدە ئەگەر چەند ساڵێکی دوور و درێژ بەخۆشی بیان ژێنین‌و ڕاببوێرن، لەپاشان ئەو سزایەی کە لێی ترسێنرابوون‌و پەیمانیان پێ درابوو بێت بۆیان و گیرۆدەی ببن، ئەوە ئەو تەمەنە درێژ و خۆشی و ڕابواردنەی بەوان درابوو هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ.

باوکم کە گوێبیستی ئەوەبوو گریا.. تاوای لێهات کەوتە سەرزەوی و، هەروەك مەڕی تازە سەربڕاو بە قاچەکانی دەیدا لەزەوی، حەسەنی بەسریش لەگەڵیدا دەستی بەگریان کردو هەناسەی هەڵدەکێشاو هەنسکی دەدا، تاوای لێهات کەنیزەکەکەی هات، وتی: شێختان شەکەت کرد، هەستن خواتان لەگەڵ.. بڕۆن.

منیش دەستی باوکم گرت و چووینە دەرەوە، کاتێك لەڕێگادا دەڕۆشتین باوکم دەستێکی بەهێزی کێشا بە سنگمدا، ئەمجا وتی: ئەی کوڕی خۆم.. بەڕاستی حەسەن چەند ئایەتێکی بەسەرماندا خوێندەوە، ئەگەر بەدڵ تێبگەشتیتایە بەدرێژایی ژیانت بریندار دەبوویت.. بەڵێ پێویستە سکاڵا ببرێتە لای خاوەن شکۆ و ڕێز، جا یان دەتدوێنێت و دڵخۆشت دەکات، یان دڵنەوایت دەکات، یاخود خۆی ئازار دەکێشێت.

**پرسیاری لێکراوە:**

دەربارەی دوو ڕوویی؟

**وتوویەتی:**

دووڕوویی جیاوازی نهێنی و ئاشکرایە، جیاوازی شوێنی چوونە ژوورەوە هاتنە دەرەوەیە، جا ئەوەی لێی دەترسێت تەنها بڕوادارە، وە ئەوەش لێی دڵنیایە تەنها دووڕووە خودا پەنامان بدات.

**پرسیاری لێکراوە:**

پیاوێك دەربارەی ئاشوب (الفتنە) پرسیاری لە حەسەن کرد و وتی: ئاشوب چیەو چی دەبێتە هۆی بەرپابوون و هاتنی؟

**وتوویەتی:**

حەسەن وتی: سوێند بەخوا هاتنی ئاشوب و بەلاّ سزای زاتی ئەڵلایە، تووشی بەندەکانی دەکات کاتێ لێی یاخی بوون و، دواکەوتن لە گوێڕایەڵی کردنی.

**پرسیاری لێکراوە:**

ئەی ئەبا سەعید لەکوێوەو بەهۆی چییەوە خەڵکی لەخودا یاخی دەبنو لەگوێڕایەڵی کردنی دوادەکەون؟

**وتوویەتی:**

حەسەن وتی: لەکەم ڕازیبوون لەزاتی خوا.

بەحەسەن وترا: دەی لەکوێوە کەم ڕازیبوون لە زاتی ئەڵڵا بەرۆکیان دەگرێت و ئەو ڕازی نەبوونە دەردەبڕن؟

حەسەن وتی: لە نەفامیان بەرامبەری‌و کەم شارەزاییان لێی.

**پرسیاری لێکراوە:**

ڕات بەرامبەر دونیا و دواڕۆژ چی یە؟

**وتوویەتی:**

نموونەی دونیا و دواڕۆژ وەك نموونەی خۆرهەڵات و خۆرئاوایە.. هەر کاتێك لەیەکێکیان زیاتر نزیك بوویتەوە، لەوی دیکەیان زیاتر دوور دەکەوێتەوە.°

**پرسیاری لێکراوە:**

وەسفی ئەم ماڵەی دونیامان بۆ بکە..

**وتوویەتی:**

---

°لە پەڕاوی ((صور من حیاة التابعین)) نوسینی: د.عبدالرحمان رأفت باشا وەرم گرتووە. ((وەرگێڕ))

وەسفی چیتان بۆ بکەم، دەربارەی ماڵێك کە سەرەتاکەی چەرمەسەری و شەکەتی یە، کۆتاییەکەشی تیاچوون و نەمانە، هەرکەس تیایدا دەوڵەمەند بێ پێی تاقیدەکرێتەوە، دەشتوانین بڵێین پێی تووشی بەلا دەبێت، هەر کەسیش تیایدا هەژار بێت پێی دڵتەنگ دەبێت.

ئەوەی جێگەی دڵخۆشیە لەم ماڵەدا ئەوەیە، لە پەیڕەوی کردنی حەلالّ ڕەواکانیدا پاداشتی چاك هەیە، وە لە ئەنجامدانی حەرام و قەدەغەکراوەکانیدا سزا هەیە.[٦]

**پرسیاری لێکراوە:**

دەربارەی حاڵی خۆی و خەڵکی کە چۆنە حاڵیان؟

**وتوویەتی:**

ئەی هاوار هەی چیمان بەخۆمان کرد!!

بەڕاستی دینەکەمان لاوازکردووە و پشتگوێمان خستووە، بەلام دونیامان ڕازاندۆتەوەو چاکمان کردووە..

ڕەوشتەکانمان قیزەون و کەنەفت کرد، لەولاوە ڕاخەر و پۆشاکەکانمان نوێ کردۆتەوە.. یەکێك دەبینی لەسەرشان پاڵی

---

[٦] لە پەڕاوی ((صور من حیاة التابعین)) نوسینی: د.عبدالرحمان رأفت باشا وەرم گرتووە.

(وەرگێڕ)

داوەتەوە، لەماڵ و سامانێك دەخوات كەهی خۆی نییە، بەڵكو ڕەنجی شانی خەڵكی ترە، خۆراكەكەی داگیركراوە، خزمەتكردنی بەزۆرە، داوای شیرینی بەدوای ترشیدا و، گەرم بەدوای سارد و.. تەڕ و تازە بەدوای ووشك كراوەدا دەكات. هەتا هەناسە بڕكێ یەخەی دەگرێت و لە ئەنجامی زۆر خواردن دەكەوێتە هێڵنج و ئێق دانەوە، ئەمجا هاوار دەكاتو دەڵێت:

هەی هاوار ڕۆڵە فریاكەوە.. هازیمەیەكم فریاخە كە خواردن هەزم بكات.

ئەی نەفام.. سوێند بەخودا، جگە لە دینەكەت هیچ شتێك هەزم ناكەیت.

لەكوێیە دراوسێ ئاتاجەكەت كەبیرت بەلایەوە نەبوو؟!

لەكوێن بێ باوكانی برسی گەلەكەت كە لێیان بێ ئاگابوویت؟!

كوان ئەو هەژارانەی كە لەكاتی لێسەو هەڵپەو گەڵپەی خواردنەكانتا بۆیان دەڕوانیت؟!

بۆ بێ ئاگای لەو ئامۆژگاریانەی كە خودای باڵادەست دەربارەی ئەم ماڵی دونیایە كردیتی؟!!

خۆزگە باش بتزانیایە کە تۆ ژمارەیەکی لەڕۆژانێکی دیاریکراو.. هەر کاتێك خۆری ڕۆژێکت لێ ئاوا دەبێت شتێك لە ژمارەکانت کەم دەبێتەوەو، هەندێك لە تەمەنت لەگەڵیدا دەڕوات.[7]

## پرسیاری لێکراوە:

لەبەڕێکردنی جەنازەیەکدا بۆ بەخاك سپاردن پیاوێك لە خزمەتی حەسەنی بەسریدا بوو، کەسوکاری جەنازەکە دەگریان و لاوانەوەیان دەکردو لەخۆیان دەدا، پیاوەکە بە حەسەنی وت:

بەڕاستی ئەوە کارێکی خراپ و ناشەریعە لەبەرئەوە من دەمەوێت بگەڕێمەوە، تۆ چی دەفەرمووی؟

## وتوویەتی:

ئەی برای خۆم: کاتێك تۆ هەر خراپە و ناشەرعیەکت بینی و بەهۆیەوە وازت لە چاکەیەك‌و کارێکی شەرعی هێنا، دڵنیابە ئەوە زۆر بەخێرایی کار لە دینەکەت دەکات‌و بەرەو سستی و ساردبوونەوە دەتبات.

---

[7] لە پەڕاوی ((صور من حياة التابعين)) نوسینی: د.عبدالرحمان رأفت باشا وەرم گرتووە.

(وەرگێڕ)

**پرسیاری لێکراوە:**

لەڕاستیدا فلاّنەکەس ئامۆژگاری ناکات (وعظ) و دەڵێت: دەترسم لەوەی کەشتێك بڵێم و خۆم نەی کەم.

**وتوویەتی:**

دەی کام کەس لەئێمە ئەوە دەکات کە دەیڵێت.. شەیتان دڵخۆش دەبێت بەوەو زەفەر بەبڕواداران دەبات، کاتێ فەرمان بەچاکە نەکرێت و نەرێش لە خراپە نەکرێت.

ئەگەر ئەوەی کە گوناهبارە ئامۆژگاری یاخی و تاوانبار نەکات، ئیتر کێ لەدوای موحەممەد ﷺ ئامۆژگاری یاخی و تاوانباران بکات؟!

**پرسیاری لێکراوە:**

دەربارەی ئەو ئاگر پەرستەی (المجوسی) لەکاتی سەرەمەرگیدا سەردانی کردبوو؟

**وتوویەتی:**

چوومە سەردانی لەکاتی سەرەمەرگدا بوو، مەرگی بەئاوات دەخواست، ماڵەکەی بەتەنیشت ماڵەکەمەوە بوو، دراوسێ یەتی زۆر چاك بوو، هەڵسوکەوتی جوان بوو، ڕەوشت بەرزبوو، لەبەرئەوە بەڕاستی

تکام له زاتی ئەڵڵا کرد که لەکاتی مردندا، لەسەر ئیسلام کۆتایی به ژیانی بهێنێت..

پێم وت: چی دەبینی و، حاڵت چۆنه؟

وتی: ئەی حەسەن: دڵێکی ناساغ و بەئازارم هەیەو تەندروستیم باش نییه، لەشێکی نەخۆشم هەیەو هێزو توانام نییه، گۆڕێکی تەنگو تاریك لەپێشمەو هاودەمم نییه، سەفەرم دوورەو توێشووم پێ نییه، ڕێگایەکی باریك و تەنگەبەر لەبەر دەممدایەو گوزەر نامەم پێ نییه، ئاگرێکی کڵپەدار ئامادەیەو هەر دەبێت منی تێ بچم، بەهەشتێکی بەرز و بڵندو ڕازاوه ئامادەیەو بەشی منی تێدانییه، لەکۆتاییدا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: ئەوەش پەروەردگارێکی دادپەروەره، کەچی من دەست بەتاڵ و بێ بەڵگەم.

حەسەن وتی: که گوێبیستی ئەوه بووم زۆر بەزەییم بەحاڵیدا هاتەوه و، تکام لەخودای باڵادەست کرد که هاریکاری بکات و تەوفیقی بدات، ئەمجا ڕووم تێکرد و پێم وت: بۆچی موسڵمان نابێت و ئیمان ناهێنێت تا سەلامەت بیت؟

وتی: ئەی شێخ، بەڕاستی کلیل بەدەستی بکەرەوەیەو، قوفڵێش ئالێرەدایه، ئاماژەی بۆ سنگی کرد و، ئیتر لەسەرخۆی چوو.

حەسەن وتی: که ئەوەم بینی ڕووم لەزاتی ئەڵڵاکرد و وتم:

خودای من و گەورەو سەرپەرشتیارم، ئەگەر ئەم ئاگرپەرستەی لای جەنابت چاکەیەکی هەیە پێشی بخە، پێش دەرچوونی ڕۆحی و بێ میوابوونی..

سوپاس بۆ خودا هەر لەدوای پاڕانەوەکەی من ئاگرپەرست هاتەوەسەرخۆ و چاوەکانی کردەوە و، ئەمجا ڕووی لەمن کردوو وتی:

ئەی شێخ: بەڕاستی خاوەن دەرگا کلیلی ڕەوانەکرد بۆ کردنەوەی قوفڵەکە، دەستی ڕاستت بهێنە، ئەمجا وتی: (أشهد ألا إله إلا الله و أشهد أن محمّداً رسول الله) ئیتر گیانی دەرچوو و بەرەو ڕەحمەتو میهر و سۆزی زاتی ئەڵڵا بەڕێکەوت.[8]

## پرسیاری لێکراوە:

ئەی ئەبا سەعید بەڕاستی تۆ بە وتەگەلێك دەدوێیت جگە لەتۆ لەکەسێکی تر نەبیستراوە، دەی ئەوەت لەکوێ وەرگرتووە و هێناوتە؟

## وتوویەتی:

لە حوذەیفەی کوڕی یەمانەوە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وەرم گرتووەو هێناومە.

---

[8] سەرنج بدە نزا و تکای حەسەنی بەسری چۆن لەلای خودای میهرەبان وەرگیرا بۆ ئەو ئاگر پەرستە، دەی دەبێت چۆن نزا و تکای باوەڕدار بۆ باوەڕدار گیرانەبێت لەلای پەروەردگار؟!

وتراوه به حوزەیفه ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ: دەتبینین به وتەیەك دەدوێیت جگه لەتۆ له کەسێکی دیکه نەبیستراوه، ئەوەت لەکوێ وەرگرتووه؟.

حوزەیفه ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وتی: پێغەمبەری خو ﷺ دا منی تایبەت کردبوو لەو وتانه، خەڵکی دەربارەی خەیر و چاکه پرسیاریان له پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد، بەڵام من دەربارەی شەڕ و خراپه پرسیارم لێدەکرد له ترسی ئەوەی تووشی ببم و تێی بکەوم.

* * *

# هەڵوێستەکانی حەسەنی بەسری

# لەگەڵ ئەمیر و

# فەرمانڕەواکاندا

## هەڵوێستی یەکەم:

ڕۆژێکیان (عومەری کوڕی هوبەیر)، کە یەکێك بوو لە ئەمیرەکانی یەزیدی کوڕی موعاویە، حەسەنی بەسری و (عامری کوڕی شەرحەبیل) کە ناسراوبوو بە (ئەششەعبی) بانگ کرد بۆلای خۆی و پێی وتن:

بێگومان ئێوە ئاگادارن کە (یەزیدی کوڕی موعاویە) خودا کردوویەتیە جێنشین (خلیفە) بەسەر بەندەکانیەوە، گوێڕایەڵیشی لەسەریان پێویست کردووە. وەك ئێوە دەبینن و دەزانن ئەوەتا منیشی کردووەتە والی (عێراق) و (فارس).

هەندێك جار فەرمان بە من دەدات بۆ جێبەجێکردنی کۆمەڵێك بڕیار و فەرمان، کەمن بەڕاستی دڵنیانیم لە دادپەروەری ئەو بڕیار و فەرمانانە، دەی ئایا ئێوە بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیار و فەرمانانە هیچ ڕوخسەتێك لە دین دا دەبینن بۆمن؟

شەعبی وەڵامێکی دایەوە کە دڵڕاگرتنێکی بۆ خەلیفە تێدابێ و گونجاویش بێت بۆ والی؟

حەسەن هیچی نەوتوو بێدەنگ بوو..

عومەری کوڕ هوبەیرە لە بێدەنگی حەسەن سەری سوڕما و پاشان لای کرد بەلایەوە و پێی وت:

ئەی ئەبا سەعید تۆچی دەڵێیت؟

حەسەن وتی:

ئەی کوڕی هوبەیرە لە یەزید مەترسە لەوەدا کە خودا دەیکات، بەڵام ئاگاداربە لەخودا بترسە لەوەدا کە یەزید دەیکات. چونکە دڵنیابە کە خودای باڵادەست دەتپارێزێت لە یەزید، بەڵام یەزید ناتوانێت لەخودا بتپارێزێت.

ئەی کوڕی هوبەیرە: بەڕاستی نزیکە کە فریشتەیەکی توندوتیژ کە سەرپێچی خودا ناکات بێتە لاتو لەسەر ئەو جێگەیەتەوە بتگوێزێتەوە لە کۆشکە فراوانەکەتەوە بۆ ناو گۆڕە تەنگو تارەکەت، کەلەوێدا یەزید شك نابەیتو نای بینیت، بەڵکو ئەوەی دەی بینیت ئەو کردارەتە کە سەرپێچی پەروەردگاری یەزیدت پێکرد.

دڵنیابە ئەگەر تۆ لەگەڵ خودادا بیتو گوێڕایەڵی بیت، بەسە کە بتپارێزێت لە ئازار و ئەزیەتی (یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك) لە دونیا و دوارۆژدا.

بەڵام ئەگەر لەگەڵ یەزیددا بیت لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوداداو یاخی بوون لێی، ئەوە دڵنیابە کە خودا وازت لێ دەهێنێت و دەکەویتە بەرخەشم و ئەزیەت و ئازاری یەزید، باش بزانە ئەی کوڕی هوبەیرە کە بەهیچ جۆرێكو هیچ هۆکارێك گوێڕایەڵی نییە بۆ هیچ بەدیهێنراوێکی خودا لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خودای باڵادەستدا.

عومەری کوڕی هوبەیرە کە گوێبیستی ئەوەبوو لە حەسەن گریا.. گریا.. هەتا فرمێسکەکانی ڕیشەکەی تەڕکرد، ئەمجا ڕووی لە (شەعبی) بەرەو (حەسەن) وەرگێڕاو زۆر زۆر زیاتر لە (شەعبی) ڕێزی لێ گرتو بەگەورە ڕای گرت، کاتێکیش پاداشتی دانەوە، پاداشتی حەسەنی دوو چەندانە دایەوە.

جا کە هەردووکیان یەزیدیان بەجێ هێشت و بەرەو مزگەوت چوون، خەڵکیان لێ کۆبوونەوەو دەربارەی دەنگوباسیان لەگەڵ ئەمیردا (عومەری کوڕی هوبەیرە) پرسیاریان لێکردن.

شەعبی لای کرد بەلایانەوە و وتی:

ئەی خەڵکینە کێ لەئێوە دەتوانێت لە هەرشتێکدا کە بیەوێت فەزڵی خودا بدات بەسەر بەدیهێنراوەکانیدا با بیکات.

بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ئەوەی حەسەن وتی بە عومەری کوڕی هوبەیرە منیش دەمزانی و دەمفاماند.. بەڵام من لەوەدا کە وتم مەبەستم دڵڕاگرتنی کوڕی هوبەیرە بوو، بەڵام حەسەن ئەوەی وتی لەبەرخاتری خودای باڵادەست بوو.. لەبەرئەوە خودا ڕووی عومەری لە من وەرگێڕاو حەسەنی لەو نزیک خستەوەو خۆشەویستی کرد لەلای و بووە جێگەی زیادە ڕێزگرتن و بەگەورە ڕاگرتنی.

## هەڵوێستی دووەم:

کاتێك (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) بووە والی عێراق‌و لەویلایەتیەکەیدا دەستی دایە یاخی بوون و ستەم و زۆرداری کردن..

حەسەنی بەسری یەکێك بوو لەو کۆمەڵە پیاوە دەگمەنانەی کەلەسەر یاخی بوون و زۆرداری و ستەمکردنی ڕووبەڕووی بوونەوە و، کردارە خراپەکانی حەجاجیان لەنێو خەڵکدا ڕاگەیاند و ئاشکرایان کرد، وە بەوشەی حەق بەڕوویدا چوونەوە.

لە نموونەی ئەوە، (حەجاج) لە (واسط)[٩] خانوویەکی بۆخۆی دروست کرد، کە تەواوی کرد جاڕیدا بەنێو خەڵکیدا تا بێنە سەیرکردنی و نزای بۆ بکەن.

حەسەن نەی ویست ئەو فرسەتە لەکیس بدات، لەبەرئەوە کە بینی خەڵکەکە کۆبوونەتەوە، چوو بۆلایان، تا ئامۆژگاریان بکات و ئەوەی پێویستە یادیان بخاتەوە و، بیّ باکیان بکات لە دونیا و لەزەت و بەهرەکانی و سەرنجیان بۆ ئەوە ڕابکێشێت و ئارەزوومەندیان بکات کە لەلای خودای باڵادەستە.

---

[٩] شارێکە لەعێراق دەکەوێتە نێوان بەسرە و کوفەوە.

جا کە گەیشتە شوێنەکە و بینی وا جەماوەری خەڵکەکە دەگەڕێن بەدەوری خانووە ڕازاوەکەدا و، ڕاماون بەجوانی دروست کردنی و فراوانی بەشەکانی و قەشەنگی ڕازاندنەوەی..

لەناویاندا ڕاوەستا و، دەستی بەوتاردان کردو، فەرمووی:

ئەی خەڵکینە وابینیمان و سەرنجماندا ئەوەی کە پیسترینی پیسەکان دروستی کردووە، وە دەشزانین کە فیرعەون لەوە گەورەتر و بڵندتری هەڵخست و بنیات نا.. وە بینیشمان چۆن خودای باڵادەست فیرعەونی لەناوبرد و، ئەوەشی تێك و پێکدا کە دروستی کردبوو و بڵند و قەشەنگ هەڵی خستبوو.. جا خۆزگە حەججاج ئەوەی بزانیایە کە خەڵکی ئاسمان فریشتەکانی عەرش لێی بەقینن و بێزی لێدەکەنەوە، خەڵکی سەر زەویش فێڵیان لێ کرد و بەدووڕوویی هەڵیان خەڵەتاند تا گومڕایان کرد.

بەردەوام بەو شێوەیە وتەکانی دەدا بەگوێی خەڵکیدا، هەتا پیاوێك لە بیسەران بەناچاری بۆئەوەی حەسەن بەر خەشمی حەججاج نەکەوێت پێی وت:

بەسە ئەی ئەبا سەعید بەسە.

حەسەن پێی وت:

ئەی بەندەی خودا، خودا پەیمانی لە زانایان وەرگرتووە، ئەوەی کە دەیزانن لەحەق بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە و نەیشارنەوە..

بۆ سبەینێ حەججاج ئامادەی کوڕەکەی بوو، لەڕق و کینی خۆیدا خەریك بوو پارچەکانی لەشی لەیەك دەپچڕا، لەوکاتەدا بەئامادەبووانی وت:

دەی تیابچن و لەبەرچاودا نەمێنن..

بەندەیەك لە بەندەکانی خەڵکی بەسرە، هەڵدەستێت لەبەرچاوی ئێوەدا ئەوەی دەیەوێت بەئێمەی دەڵێت کەچی ئێوە یەکێکتان تێدانەبووە ڕووبەڕووی ببێتەوە و وەڵامی بداتەوە و بەگژیدا بچێتەوە!!

سوێند بەخودا ئەی ترسنۆکینە ئەمڕۆ لە خوێنەکەی تێر ئاوتان دەکەم، ئینجا دەست بەجێ فەرمانی بەئامادەکردنی شیر و پارچە پێستێکی ڕاخەر بۆ ئیعدام کردن و لەگەردن دانی.. دوای ئامادەکردنی شیر و ڕاخەرەکە، داوای جەللادی کرد، جەللاد خێرا ئامادەی بەردەمی بوو..

پاش ئەوە هەندێ لە پۆلیسەکانی نارد بەدوای حەسەندا تابیهێنن بۆلای.. زۆری پێنەچوو حەسەن هات.. لەوکاتەدا خەڵکەکە چاویان تێبڕیبوو، دڵیان بۆ دەلەرزی.. حەسەن کاتێك شیر و پارچە ڕاخەر و جەللادی بینی ئامادەکرابوون هەردوو لێوی جوڵاند.

پاشان کەوەك بڕوادارێکی بەعیززەت و خاوەن ڕێز و بانگخوازێکی خۆیەکلاکەرەوەی خاوەن شان و شکۆ تەنها بۆلای خودای باڵادەست،

ئامادەی بەردەمی حەججاج بوو، ئەویش شەرمی لێکرد و، بەبینینی ترس و بیمێکی زۆری لێ نیشت، ئەمجا پێی وت:

فەرموو ئەی ئەبا سەعید ئالێرەدا.. فەرموو ئالێرەدا.. ئیتر بەردەوام خۆی لە ئاستیدا دەکردەوە و دەی وت:

ئەبا سەعید فەرموو ئالێرەدا، خەڵکەکەش بەسەر سوڕمانەوە سەرنجیان دەدا تا لەسەر ڕاخەرەکەی خۆی دای نیشاند.

کە حەسەن لە تەنیشتی یەوە لەگەڵیدا دانیشت، حەججاج لای کرد بەلایەوە و لەبارەی هەندێ کاروباری دینیەوە دەستی بە پرسیارکردن کرد لێی، حەسەنیش بەزمانێکی جێگیر و، دەربڕینێکی زانستیانە و سەرنج ڕاکێش وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانی دایەوە.

حەججاج کە گوێبیستی وەڵامەکانی بوو پێی وت: بەڕاستی ئەی ئەبا سەعید تۆ گەورەی زانایانی.

ئەمجا داوای بۆنی تایبەتی کردو فەرمانی کرد ڕیشیان بۆندارکرد، دوای ئەوە بەڕێزەوە خواحافیزی لێکرد. کاتێك حەسەن چووەدەرەوە و بەجێی هێشت، دەرگاوانەکەی حەججاج شوێنی کەوت و پێی وت:

ئەی ئەبا سەعید بەڕاستی حەججاج بۆ مەبەستێکی دیکە بانگت دەکاتەوە، فەرموو بگەڕێرەوە، حەسەن گەڕایەوە لای..

حەججاج پێی وت: ئەی ئەبا سەعید من کەتۆم بینی هاتیت و شیر و پارچە ڕاخەر و جەللادت بینی لێوەکانت دەجولاند مەبەستمە بزانم چیت دەوت؟

حەسەن لەوەڵامیدا وتی: وتم ئەی سەرپەرشتیاری بەهرەکانم و پەناگام لەکاتی تەنگەژە و غەممەکانمدا، خەشم و قینی حەججاج لەبەرامبەرمدا ساردبکەرەوەو بێوەی و سەلامەتم بکە لێی، هەروەك ئاگرەکەت ساردکردەوەو ئیبراهیمت تیایدا سەلامەت و بێوەی کرد.

* * *

## هەڵوێستی سێ یەم:

له دوونامەیدا بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ:

**نامەی یەکەم:**

ئەی ئەمیر: دڵنیابە..

دونیا خەوبینینە..

دوا ڕۆژ بەئاگابوونەوەیە..

مردن نێوەندیی ئەو دووانەیە..

ئێمەش لەنێو کۆمەڵێک خەوبینینی بێ سەرەو بەرەداین..

هەر کەس لێپرسینەوەی ناخی خۆی بکات تیایدا قازانج کارە،

هەرکەسیش تیایدا بێ ئاگابێت ئەوە زەرەرۆمەندە،

هەرکەس تیایدا بڕوانێت بۆ سەرئەنجامەکان ئەوە ڕزگاربووە،

هەر کەس تیایدا گوێڕایەڵ و شوێنکەوتەی ئارەزووەکانی بێت ئەوە گومڕاو سەر لێ شێواو دەبێت،

هەر کەس تیایدا دان بەخۆداگر بێت براوەیە،

هەر کەس تیایدا بترسێت بێوەی دەبێت،

هەر کەس تیایدا پەند وەربگرێت دووربین دەبێت،

هەرکەس تیایدا دووبینی کرد تێدەگات، ئەوەی تیایدا تێ گەیی فێردەبێت، ئەوەی فێربوو تیایدا کاردەکات، جا ئەگەر هەڵخلیسکایت و

لەڕێ دەرچوویت دەست بەجێ بگەڕێرەوە، وە ئەگەر لەکارێك پەشیمان بوویت دەست بەجێ وازی لێ بهێنە، ئەگەر نەزان بوویت بە شتێك پرسیاربکە، کە توڕەبوویت دەست بەجێ دان بەخۆتدا بگرە و هەڵمەچۆ.

**نامەی دووەم:**

**ئەی ئەمیر: دڵنیابە..**

بەڕاستی دونیا ماڵی کۆچکردنە، نەك ماڵی نیشتەجێ بوون، لە ڕاستیدا ئادەم وەك سزادانێك تیایدا نیشتەجێ کرا، دەی کەوایە زۆر ئاگاداری بە..

دڵنیابە توێشوو تیایدا واز لێ هێنان و پشت تێکردنیەتی، دەوڵەمەندی تیایدا بێ باکیە لێی، لە هەر چرکە ساتێکدا کوژراویکی هەیە، ئەوەی بەشکۆمەندی رای بگرێت ڕسوا دەبێت، هەر کەس کۆی بکاتەوە هەژار و مایەپوچ دەبێت..

ئەو وەك ژەهر وایە ئەو کەسە دەیخوات کە نای ناسێت، سەرئەنجام مەرگیەتی، کەوایە تیایدا وەك ئەو کەسەبە برینەکەی دەرمان دەکات تا تەشەنە نەسێنێت، خۆی ڕادەگرێت لەسەر دەرمانکردن‌و ناخۆشی خواردنیان تا زیاتر ئێش و ئازار نەکێشێت و برین و نەخۆشیەکەی درێژە نەکێشێت.

ئەی ئەمیر:

ئاگات لەم ماڵە فێڵبازە هەڵخەڵەتێنەرە چەواشەکارە، لەبارییەرە بێت..

ئەوەی بەفێڵ ئاواتەکانی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ لە خشتەبردن..

بۆ عاشقانی وەك بوکێکی ڕازاوەی قەشەنگ خۆی دەنوێنێ، چاوەکان بەردەوام لەسەرین، دڵەکان بۆی دەکوڵێن، ناخەکان بۆی ئارەزوو مەندن..

بەردەوام بۆ هاوسەر و خوازیارانی بکوژە، ئەو عاشقەی بەبەشێك لە ئاواتەکانی دەگات لەگەڵیدا، پێی گومڕا دەبێتو دواڕۆژی لەبیردەکات، مێشك و ژیریی پێوەی سەرجەنجاڵ دەبێت تا پێی هەڵدەخلیسکێت و، پەشیمانیەکی گەورە دای دەگرێت، دەستەو ئەژنۆ هەناسەی سارد هەڵدەکێشێت، تا لە ئەنجامدا ئێش و ئازاری سەرەمەرگ و مردن لەسەری کۆدەبێتەوە، وە ئەو عاشقەی بێ بەش بووە لەبەدەست خستنی ئاواتەکانی تیایدا، ئەوە لە ڕاستیدا بەخەفەتەوە ژیاوەو لەگەڵ هەموو هەوڵێکیشیدا هیچی بەهیچ نەکردووە تیایدا، سەرئەنجام ناخی پشووی نەداوە و پاش شەکەتیەکی زۆر بەبێ توێشوو لێی دەرچووە.

کەواتە تۆ ئەی ئەمیر:

تیایدا زۆر ئاگاداریە لەوەی هەوڵی بۆ بدەیت، چونکە بەڕاستی خاوەن دونیا و عاشقی، هەر کاتێك بەرەو خۆشیەك بڕوات و لێی

دڵنیابێت، کاتێك دەزانێت ناخۆشیەك ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بەدوای خۆشگوزەرانیدا بەڵا و ناڕەحەتیە، مانەوە تیایدا بەرەو تیاچوونە..

خۆشیەکانی تێکەڵە بە دڵتەنگی غەم و پەژارە، ئاواتەکانی درۆیە، هیواکانی بەتاڵە و بۆشە، ڕووناکیەکانی لێڵە، ژیان تیایدا چەرمەسەرێیە.

ئەوەتا خودای پەروەردگار دەربارەی ئامۆژگاری دەدات و ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەمماڵی دونیایە هیچ بەهاو نرخێکی نییەو، لەو کاتەوەی بەدی هێناوە بەچاوی بەها سەیری نەکردووە، نموونەش دەهێنێتەوە پێی بۆ بەندەکانی کە وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە دەی بارێنێت، ئەوسا جۆرەها ڕوواوی زەوی پێ دەڕوێت‌و دەچن بەناویەکدا، ئەمجا دەبنە پوش و پەڵاش‌و با پرش‌و بڵاویان دەکاتەوە..

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ﴾ الكهف: ٤٥.

ئەی ئەمیر: خودای پەروەردگار دونیای بە سەرجەم کلیل و گەنجینەکانیەوە خستە بەردەستی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کەلەلای ئەو بەهای باڵە مێشولەیەکی نییە و، بەو بەخشین و ڕادەستکردنەش هیچ لە دەسەڵات‌و موڵك و سامانی ئەو کەم ناکاتەوە.. بەڵام ئەوەتا پێغەمبەری سەروەر ﷺ نکۆڵی دەکات لەوەی کە وەری بگرێت، پێی ناخۆش بووە شتێك خودای پەروەردگار بی بوغزێنێ و بێ بەها سەیری

بكات ئەم خۆشی بوویت، وە شتێك ئەو بە نزم سەیری بكات، ئەم ﷺ بەرز ڕای بگرێت..

خودای باڵادەست دونیای لە بەندە چاك و دڵسۆزەكانی بەدوورگرتووە و، بەرفراوانی كردووە بۆ نەیاران و پشت تێكردوانی تا پێی لەخۆبایی ببن و سەرئەنجام بەڕسوایی بەجێی بهێڵن، لەڕاستیدا لەخۆبایی بەماڵی دونیا بڕوای وایە كە بەهۆی ئەو ماڵەوە ڕێزدارەو ڕێزلێنراوە، ئیتر ئەوەی لەبیركردووە كەخودای باڵادەست چۆن ڕێزی بەخشی بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و ڕێزداری كرد لەكاتێكدا ئەو ﷺ لە دونیادا لەبرسا بەردی لەسەر سكی شەتەك دەدا.

جا ئەی ئەمیر: پێش ئەوەی دونیا بەڕسوایی لەسەر تەختە شۆر ڕات بكێشێت و دەست بەتاڵ بەڕێت بكات بۆ قیامەت، بی بوغزێنە، بێ بەها سەیری بكە و كار بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار بكە تا سەربەرزانە لێی دەربچیت بۆ خزمەتی پەروەردگارت.[10]

* * *

[10] لە پەڕاوی (وقفات و مواعظ من حياة الحسن البصري)) نووسینی ((أمير بن محمد المدري)) وەرم گرتووە.

((وەرگێڕ))

# هەندێ لە بۆچوونە ناوازەکانی حەسەنی بەسری[11]

[11] لە پەڕاوی: معالم في التربية والدعوة مواعظ الإمام الحسن البصري ((٢١ – ١١٠هـ))، قام بجمعها صالح أحمد الشامي/ وەرمگرتووە ((وەرگێڕ)).

## بۆچونی دەربارەی:

### ١) ماڵ و سامانی زیادە:

خودا ڕەحمەتی خۆی بڕژێنێت بەسەر ئەو کەسەدا کە ماڵ و سامانی حەڵاڵ و ڕەوا بەدەست دەخات و، بەپێی پێویست خەرجی دەکات و، زیادەکەشی پێش دەخات.

بڕوادارینە: ماڵ و سامانی زیادەتان بەرەو ئەو شوێنانە ڕەوانە بکەن کە خودا دیاری کردووە، هەروەها لەو شوێنانەدا دای بنێن کە خودا فەرمانی کردووە.

### ٢) لە دەرگادانی دەسەڵاتداران:

نەکەی بەردەوام لەدەرگای دەسەڵاتدار بدەیت و بچیتە لای، ئەگەر وتیشت بۆئەوە دەچم فەرمانی بەچاکە پێدەکەم و نەرێی لێدەکەم لە خراپە. ئەوە بزانە هەرکەس نزای پایەداری و مانەوە بکات بۆ ستەمکار، ئەوە پێی خۆشە لەزاتی ئەڵڵا یاخی ببێت لەسەر زەویەکەیدا.

### ٣) ئەوەی سەری بەخۆی سوڕدەمێنێ:

ئەی نەوەی ئادەم، سەرت بەلاویەتی و جوانی و پۆشاکەکەت سوڕدەمێنێ، ببینە چۆن گۆڕ لەش و لارەکەت دادەپۆشێ، ئەمجا کردارەکانت گەردنت دەگرن و ڕوویەڕوت دەبنەوە، کەوایە فریابکەوە

دڵەکەت چارەسەربکە، چونکە خودا خاوێنی و بێگەردی دڵەکانی لەبەندەکانی دەوێت.

٤) لەخۆبایی بوون بە هۆی خەڵکەوە:

ڕەحمەتی خودا لەو کەسەی بەبینین‌و تێکەڵاوی زۆر لە خەڵکی لەخۆبایی نابێت.

ئەی نەوەی ئادەم، دڵنیابە تۆ بەتەنها دەمریت، وە بەتەنها دەچیتە گۆڕ و، بەتەنها زیندوو دەکرێیتەوە، بە تەنهاش موحاسەبە دەکرێیت، تەنها خۆت مەبەستی‌و هەر تۆش داوادەکرێیت.

٥) دووڕوویی «النفاق»:

جگە لە بڕوادار کەسی تر ناترسێت لە دوڕووی، ئەوەی لێی دڵنیایەو بیمی لێی نییە تەنها کەسی دووڕووە.

وتراوە بە حەسەن کەسانێك هەن دەڵێن: ئێمە لەدووڕوویی ناترسین.

ئەویش لەوبارەوە وتوویەتی:

سوێند بەخودا ئەگەر من بزانم و دڵنیابم لەوەی بەریم لە دووڕوویی ئەوە لەلام خۆشترە لەوەی بەئەندازەی هەموو چیا و ڕووبار و دۆڵەکانی سەرزەوی زێڕم هەبێت.[١٢]

**هەروەها وتوویەتی:**

بێگومان لەدووڕوویی یە: جیاوازی زمان و دڵ، وە نهێنی و ئاشکرا، **هەروەها** چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە، (واتە: چوونە لای خەڵك و دەرچوون لەلایان).

### ٦) ناخی لۆمەکار ((النَّفس اللَّوامه)):

دەربارەی فەرموودەی زاتی ئەڵڵا: ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾

واتە: سوێند دەخۆم بەناخی لۆمەکار. وتوویەتی:

بڕوادار **هەرکە** دەی بینی لۆمەی ناخی خۆی دەکات، **هەرکە** دەیەوێت وشەیەك بڵێت بەناخی خۆی دەڵێت مەبەستت بە ئەو وشەیە چیە؟ **هەروەها** لەکاتی خواردنی پارویەکدا دەڵێت: ئەی نەفس مەبەستت بەخواردنی ئەو پاروە چیە؟ یان کە بیەوێت ئامادەی کۆڕێك بێت پێی دەڵێت مەبەستت لە ئامادەبوونی ئەو کۆڕە چیە؟ بەڵام خراپەکار

---

[١٢] لەپەڕاوی ((قوت القلوب))دا، ١/٢٣٤، بەئەندازەی ئەوەی خۆر بەسەریدا هەڵهاتووە.

دەبینیت بەردەوام دەڕوات و هەنگاو هەڵدەگرێت، بەبێ ئەوەی لۆمەی ناخی خۆی بکات.

### ٧) موسڵمان:

لە نیشانەکانی موسڵمانی تەواو: بەهێزی لەدیندا، ڕاوەستاوی لە نەرم و نیانیدا، بڕوا لە یەقیندا، بڕیاردان لە ڕووی زانستیەوە، ناخ ڕاهێنان لەسەر خۆڕاگری و نەرم و نیانی لەگەڵ فەرمانەکانی خودادا.. بەخشین لە ئەنجامدانی حەقدا، دەست پێوەگرتن لە دەوڵەمەندیدا، خۆڕاگری لەکاتی هەژاری و نەبوونیدا، چاکەکردن لەکاتی دەسەڵاتدا، گوێڕایەڵی لەگەڵ ئامۆژگاری کردندا، خۆگرتنەوە لە ئارەزووبازیو پاك ڕاگرتنی داوێن، ئارامگرتنو خۆڕاگری لەکاتی نارەحەتیدا. موسڵمان ئارەزووی نای ترازێنێتو بەلارێدا نایبات، زمانی ڕادەگرێت لەهەڵەوەری. چاوی لە بینینی نارەوا دەپارێزێت، داوێن پیسی بەسەریدا زاڵ نابێت، زمانی شەرمەزاری ناکات، سوربوونی لەسەر دونیا سووك و ڕسوای ناکات، نیەتی تووشی کەمتەرخەمی ناکات.

### ٨) بەندەکانی خودا:

خودا بەندە گەلێکی هەیە وەك ئەوەن چاویان لە ئەهلی بەهەشت بێت بۆ هەمیشەیی لەنێو ناز و بەهرەکانیدا.. هەروەها وەك ئەوەی چاویان لە ئەهلی دۆزەخ بێت بۆ هەمیشەیی لەنێو ئێش و ئازار و

ئەشکەنجەیدا، هەمیشە ئەو کەسانە دڵیان تەنگە.. شەڕ و خراپەیان نییەو خەڵکی لێیان دڵنیان، پێویستیو ئاتاجیەکانیان سووک و سادەن، ناخیان پاك و بێگەردە.

چەند ڕۆژانێکی کورت لەسەر خودا پەرستی و چاکەکردن خۆڕادەگرن، بەدوایدا پشو و خۆشنودیەکی دوور و درێژ و نەبڕاوە دێت.

شەویان ڕاوەستانیانە لەسەر پێیەکانیان، فرمێسکەکانیان بەسەر ڕوومەتەکانیاندا دێنە خوارەوە و، لە تەنهایدا هاواردەکەن: پەروەردگارمان.. پەروەردگارمان.

ڕۆژیشیان خۆڕاگریو لەسەرخۆیی و چاکەکاری بەرامبەر خراپەو زانایانە هەڵسوکەوتکردنە، کاتێك کەسێك سەیریان دەکات لەبەر لەڕو لاوازیان وادەزانێت نەخۆشن، لەکاتێکدا وانییە ئەوانە نەنەخۆشن و نەژیریشیان خراپ بووە، بەڵکو ئەوە کاریگەری گەورەی یادکردنەوەی ڕۆژی دواییە وای لێکردوون، کەبەردەوام لەگەڵیدا دەژین.

### ٩) ڕووبەڕووکردنەوەی کردار لەگەڵ قورئاندا:

ڕەحمەتی خودا برژێت بەسەر ئەو کەسەدا کردار و گوفتارو ڕەفتار و خوداپەرستیەکانی ڕووبەڕوو بەرامبەر دەکاتەوە لەگەڵ قورئاندا، جا ئەگەر پەسەند بوو لەگەڵ قورئاندا ئەوە جێگەی خۆیەتی سوپاس و ستایشی خودا بکاتو داوای فەزڵی زیاتری لێ بکات، خۆ ئەگەر

پێچەوانەی قورئان بوو ئەوە دەبێت پەشیمان ببێتەوە و بگەڕێتەوە، زووبەزوویی بەخۆیدا بچێتەوە.

### ١٠) سوربوون «الحرص»:

ئەی نەوەی ئادەم.. دونیا هەڵلوشینە، هەڵلوشین.. کۆکردنەوە لە دەفرێك، شاردنەوە و قایمکردن لەشوێنێکی پارێزراو و نادیاردا، شوێنکەوتنی ڕسوایی بەدوایدا، گوێنەدان بە وشکی و تەڕی، نەرمی و ڕەقی، ئەمجا کاتێك زانرا وترا: مرد.. سوێند بەخودا هەمووی بەجێ هێشت ڕۆشت بۆ دواڕۆژ.

بێگومان برِوادار لەدونیادا چەند ڕۆژێکی کەم و کورت کاری بۆ ڕەزامەندی زاتی ئەڵڵا کردووە، سوێند بەخودا پەشیمان نییە لەوەی کەشتێك لەخۆشی و بەهرەکانی توش بوویێت، بەڵام لەڕاستیدا کاتێك دونیا باوەشی بۆ کردبێتەوە، ئەو بەسووکی سەیری کردووە و بەگەڕی خستووە بۆ دواڕۆژی و، توێشووی لێ بەدەست خستووە.

دونیا لەلای ئەو ماڵ نییە، ئارەزووی بەهرەکانی ناکات، دڵخۆش نابێت بەخۆشگوزاریەکانی، تووشی هەر جۆرە توشهات و بەڵایەك ببێت لەناخی خۆیدا گەورەی ناکات، بەڵکو وای دادەنێت بەهۆی ئەوانەوە دەبێتە خاوەنی پاداشت لەلای خودا ـ جلّ جلاله ـ . هیچ بایەخێك بەبەدەستهێنانی دونیا نادات، هەتا بەئارەزوومەندیەوە دەگەڕێتەوە

بۆلای پەروەردگار، بەڕاستی شایستەی ئەوەیە پێی بوترێت، پیرۆزبێت، پیرۆزبێت، گەڕانەوەت، ئابەوە خودای باڵادەست ترسی لەسەر لادەبات، نهێنی و شەرماوەرەکانی دەپارێزێت و، لێپرسینەوەی ئاسان دەکات.

### ١١) ماڵ و دارایی:

فەرقەد وتی: چووینە خزمەتی حەسەن و وتمان: ئەی ئەبا سەعید، ئایا سەرت لە موحەممەدی کوڕی ئەهتەم سوڕ نامێنێ؟

وتی: بۆچی ڕوویدا وەلێی؟

وتمان: چووینە لای بەخۆی ڕامابوو و، شانازی بەخۆیەوە دەکرد، وتی: بڕوانن بۆ ئەو سندوقە هەشتا هەزار دیناری تێدایە زەکاتم لێ دەرنەکردووە و، سیلە ڕەحمم پێ نەگایاندوە و، هیچ ئاتاجێکیش لێی نەخواردووە..

ئێمەش وتمان: ئەی ئەبا عبدوڵلا دەی کەوایە بۆچی کۆتکردۆتەوە، وتی: بۆ نەهامەتیەکانی ڕۆژگار و، زۆرکردنی هاوەڵان و دۆستان و، زۆرداری و زویربوونی دەسەڵاتدار.

حەسەن کە گوێبیستمان بوو وتی: سەرنج بدەن لەکوێوە شەیتان بۆی هاتووە، بەهۆی زۆربوونی ماڵ و داراییەوەی، ترساندویەتی لە نەهامەتی ڕۆژگاریو، زۆرکردنی هاودەمان و دۆستانی و، زۆرداری و زویربوونی دەسەڵاتدار.

### ١٢) ئامۆژگاری کورت و پوخت:

حەسەن لەنامەیەکدا بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ خوالێی ڕازی بێت ـ بەم شێوەیە ئامۆژگاری دەکات:

ئەی ئەمیری بڕواداران: بەڕاستی تەمەن درێژی و مانەوەی دوور و درێژ سەرئەنجامەکەی جگە لە نەمان و کۆتایی هیچی دیکە نییە، کەوایە لەو نەمان و تیاچوونەت کە نامێنێتەوە، پاشەکەوت بخە بۆ ئەو مانەوەیەت کە نەمان و تیاچوونی بەسەردا نایەت.

عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ کە نامەکەی خوێندەوە، گریا و وتی: ئەبو سەعید ئامۆژگاریەکی کورت و پوختی پێشکەش کردین.

### ١٣) پیرۆزبایی بەلەدایکبوونی نەوە:

کاتێك کە خودای باڵادەست نەوەی بە کەسێك بەخشی بڵێ:

سوپاس و ستایشی پەروەردگار بکە، خودا ئەوەی کە پێی بەخشیویت بەرەکەتداری بکات‌و، بیکاتە کەسێکی ژیری پێگەیشتووی خوداناسی چاکەکار و، تۆش بەهرەمەند بکات لەچاکەکانی.

### ١٤) درهەم و دینار:

هیشامی کوڕی حەسەن وتوویەتی: گوێبیستی حەسەن بووم سوێندی دەخوارد بەخوداو دەیوت: هەر کەسێك درهەم و دینار بەشکۆمەند

سەیربکات و بەوانەوە خۆی بە شکۆمەند بزانێت ئەوە بێگومان خودا ڕسوای دەکات.

### ١٥) بەخشین:

هەر کەس بڕوا و یەقینی تەواوی هەبێت بەمانەوەی ماڵ و دارایی و پاشەکەوت کردن، ئەو دەستکراوە و بەخشێنەر دەبێت بەزۆری و بەردەوامی.

### ١٦) رق لێبونی مردن:

پیاوێك بەحەسەنی وت: بەڕاستی من رقم لە مردنەو پێم ناخۆشە.

حەسەن پێی وت: لەڕاستیدا ئەوە هۆکارەکەی ئەوەیە کە ماڵ و سامانەکەت دواخستووە و پێش خۆتت نەخستووە، خۆ ئەگەر پێشت بخستایە، ئەوە دڵنیابە زۆر دڵشاد دەبوویت کە پیایدا ڕابگەیتو بچیت بۆلای.

### ١٧) کۆکردنەوەی زانست و زانیاری:

نەکەی هەرگیز وەك ئەو کەسەبیت زانستو زانیاریو ئامۆژگاری و پەندی دانایان کۆدەکاتەوە، کەچی لە هەڵسوکەوت و کارکردنیدا وەك نەفام و نەزان و کەودەنگەکان وایە.

۱۸) زیندوو کردنەوەی شەوان:

هیچ کردارێك بەنارەحەتتر و بەتینتر نازانین لەزیندووکردنەوەی شەو بەخوداپەرستی و، خەرجکردن و بەخشینی ماڵ و دارایی.

۱۹) هەڵبژاردنی خوازبێنی کار:

پیاوێك بەحەسەنی وت: کۆمەڵێك کەس داوای کچەکەم دەکەن بەکامیانی بدەم؟

حەسەن ـ خوالێی ڕازی بێت ـ وتی: بەو کەسەیانی بدە کە خۆپارێزەو شەرم لەخودا دەکات، کە بەکەسێکی وات دا ئەگەر خۆشی بوێت ئەوە ڕێزی لێدەگرێت، وە ئەگەر خۆشیشی نەوێت ئەوە دڵنیابە ستەمی لیّ ناکات.

۲۰) پاراستنی زمان:

هەرکەس زمانی نەپارێزێت دینەکەشی بۆ ناپارێزرێت و ژیرانە پەیڕەوی ناکات. هەر کەسیش زۆر بڵێت درۆش زۆردەکات.

۲۱) غەریبی:

بڕوادار لەدونیادا وەك کەسی غەریبە، هەرگیز کێبڕکیّ ناکات لەبەدەستهێنانی شکۆمەندی دونیادا، بەلەدەستدانیشی نارەحەتو بێتاقەت نابێت، خەڵکی حاڵێکیان هەیەو ئەویش حاڵێکی تایبەت

بەخۆی، خەڵکی لەو دڵنیاو ئاسودەن، خۆشی هەمیشە بەخۆیەوە سەرقاڵە.

**٢٢) ڕازی بوون:**

ڕازی بوون زۆر زۆر قورسە، جائەوەی یارمەتیدەری بڕوادارە بۆئەوەی بەرگەی ئەو قورسیو ناڕەحەتیە بگرێت و هەمیشە ڕازی بێت بە قەزا و قەدەری خودای باڵادەست، خۆڕاگریو دان بەخۆداگرتنە.

**٢٣) لەگەڵ ئەوەی خۆش دەویسترێت:**

نەوەی ئادەم لەخۆت بایی نەبیت بەوەی کە بڵێیت: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە خۆشی دەوێت، چونکە دڵنیابە تۆ وابەست نابیت بەچاکەکارانەوە هەتا کار بەکردارەکانی ئەوان نەکەیت و، وەك ئەوان نەبیت لە چاکەکردنو خوداپەرستیدا، دەوترێت جووەکان و گاورەکان پێغەمبەرەکانیان خۆشدەوێت، نا سوێند بە خودا لەگەڵ ئەواندا کۆناکرێنەوە و ناچنە نێو ئەوانەوە، بەڵکو ئەوان دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ.

### ٢٤) ڕێگای دڵنیایی:

هەرکەس سوپاس‌و ستایشی کردە پارێزەرو بەردەوام بوونی بەهرەکان و، زەکاتی کردە پاسەوان و پەرژین بۆ لەناونەچوونی ماڵ و سامانی و زیادبوونی، هەروەها زانست و زانیاری کردە بەڵگە و ڕێنماکار، ئەوە دڵنیادەبێت و لەتیاچوون پارێزراو دەبێت، دەگاتە بەرزترین پلە و پایە.

هەرکەسیش هەر کۆکەرەوەی ماڵ و دارایی بوو، مافی خاوەن مافی لێ نەدا و، ئەو ماڵ و داراییە سەرجەنجاڵی کرد لەخودا پەرستی، ئەوە ئەو کەسە ستەمکاری خۆیەتی، هەمیشە دڵی بریندار و بەئازارە بەوەی دەستەکانی کۆی دەکەنەوە، خوداش لەولاوە داگیرکار و حەشار کارێك بەسەر ماڵ و سامانەکەیدا زاڵ دەکات و، هەرگیز دڵنیا نابێت لەتیاچوونی.

### ٢٥) بنیاتنانی دونیا:

سەرپێچی لە فەرمانی خودا مەکەن، چونکە سەرپێچیکردن لەفەرمانی ئاوەدانکردنەوەی ماڵێکە، خودا بڕیاری کاول بوون و تیاچوونی داوە.

## ٢٦) قەدەر و بڕیاری تایبەتی خودا:

ئەی نەوەی ئادەم: بەزویرکردنی خودا هیچ کەس ڕازی مەکە، لەسەرپێچیکردنی خودا گوێڕایەڵی و فەرمانبەری هیچ کەسێك مەکە، لەسەر فەزڵ و بەخششی خودا سوپاسی هیچ کەسێك مەکە، هەروەها لەوەدا کە خودا ناتداتێ لۆمەی هیچ کەسێك مەکە.

خودای باڵادەست مرۆڤ و سەرجەم بوونەوەری دروست کردووە و، لەسەر ئەو شێوەیەی بەدیهێناون ژیانیان بەسەر بردووە، جا کێ واگومان دەبات کە سووربوونی لەسەر بەدەست خستنی دونیا لەڕۆزی و بژێوی زیاد دەکات، یا بەو هەڵپەکردنەی لەتەمەنی زیاد بکات، یان ڕەنگی بگۆڕێتو لە ئەندامەکانی لەشیو شێوەی دروست بوونی زیاد بکات.

## ٢٧) مەرگ و ڕۆزی:

ئەی نەوەی ئادەم: دڵنیابە تۆ پێشخەر و دواخەری مەرگت نیت، زاڵو دەسەڵاتدار نیت بەسەر ڕۆزی و بژێویتداو، ناتوانیت ئەو ڕۆزیە بەدەست بخەیت کە هی تۆ نییە، کەوایە خۆت شەکەت مەکە و هەڵپەمەکە، دڵنیابە خۆت دەکوژیت؟!

## ٢٨) وتە و کردار:

بەڕاستی فەزڵ و گەورەییدانی کردار بەسەر وتەدا خەڵاتو شانازیە، فەزڵدانی وتەش بەسەر کرداردا شورەیی و لەکەیە.

### ٢٩) خاوەن دونیا:

حەسەن - خوالێی ڕازی بێت - کەباسی شوێنکەوتەیەکی دونیای بکردایە دەیوت:

سوێند بەخودا نەدونیا بۆ ئەو مایەوە و، نە ئەویش بۆ دونیا مایەوە، لە شوێنکەوتنیشی سەلامەت نەبوو لە شەڕ و خراپە و لێپرسینەوەی.

### ٣٠) ئومێد و ئاواتەکان و کردارەکان:

کەسانێك هەن ئاوات و ئومێدەکانی لێخۆشبوونو، پشت بەستن بەڕەحمەتی خودا بەتەواوی هەڵی خەڵەتاندون و باڵی بەسەریاندا گرتووە، هەتا لە دونیا دەردەچن، ئەوکاتە دەبینن هیچ کردارێکی چاکیان نییە، هی وایان هەیە دەڵێت: بەڕاستی من گومانی باشم بەخودا هەیەو، تکای ڕەحمەت و بەزەیی ئەو دەکەم، دەی درۆ دەکات خۆ ئەگەر ئەو گومانی باشی بەخودا ببردایە بێگومان کاری خێر و چاکی بۆ دەکرد، وەئەگەر تکای ڕەحمەت و سۆزی خودای بکردایەت، بێگومان بەکردارە چاکەکانی داوای دەکرد، ئەوەی بەبێ خۆراك و ئاو بچێتە ئەشکەوت و حەشارگەیەك بێگومان تیادەچێت و دەفەوتێت.

### ٣١) خوداپەرستی بێ گەرد:

کەسی واها هەیە بیست ساڵو زیاتر خوداپەرستی دەکاتو شەو بە خوداپەرستی و چاکە زیندوو دەکاتەوە، کەس هەستی پێ ناکات، هەتا

دراوسێکەشی، کەچی هی وەهاش هەیە شەوێك یان هەندێك شەو بە خوداپەرستی زیندوودەکاتەوە، کەچی کە ڕۆژی لێ بووەوە شانازی بەخۆیەوە دەکات و خۆی بەسەر دراوسێ کەیدا بادەدات.

یان کەسانێك لەکۆڕێکی یادکردنەوەدا ئامادە دەبن، کەسێکیان گریان زۆری بۆ دەهێنێتو فرمێسکەکانی لەوەیە بە ئاشکرا بڕژێنە خوارەوە، ئەو ئەوەندەی بتوانێت هەوڵ دەدات فرمێسکەکان بگێڕێتەوە، ئەگەر هەر بۆی نەکرا کۆڕەکە بەجێ دەهێڵێت تا خوداپەرستی و یادکردنەوەکەی تێکەڵ بە ڕیا نەبێت و پوخت و بێگەرد بۆخودا بێت.

## ٣٢) پاڵدان بە ستەمکارانەوە:

دوو سیفەت هەن ئەگەر لە بەندەیەکی خودادا چاك بوون ئەوە جگە لەو دووانە هەرچیەکی دی هەیە چاك دەبێت:

پاڵدان بە ستەمکارانەوە. یاخی بوون و لەخۆبایی بوون لە نێو بەهرەکاندا.

خودای بالادەست دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾ هود: ١١٣. واتە: پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن.

لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ﴾ طه: ٨١. واتە: زیادەڕەوی مەکەن لەبەکارهێنانی بەهرەکاندا و سوپاسگوزاربن لەسەریان ئەگینا خەشم و کینی من دەتانگرێتەوە.

**٣٣) جەژن:**

حەسەنی بەسری لە جەژنێکی ڕەمەزاندا کە خەڵك و شێوەیانی بینیوە وتوویەتی:

خودای پەروەردگار مانگی ڕەمەزانی کردۆتە گۆڕەپانی کێبڕکێ بۆ بەندەکانی، ئەوانیش بەبەجێهێنانی فەرمانەکانی کێبڕکێ دەکەن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی.

کەسانێك پێشکەوتن و سەرکەوتن.

کەسانێکیش دواکەوتن، بێ ئومێد و دەستەئەژنۆ بوون.

ئەو کەسە جێگەی تیاڕامان و سەرسوڕمانە لەڕۆژێکدا یاریکەر و دەم بەپێکەنینە، کە تیایدا چاکەکاران سەردەکەون و، خراپەکارانیش زەرەرۆمەند دەبن و دەدۆڕێن.

جا سوێند بە خودا خۆ ئەگەر پەردە لابرایە دەبینرا چۆن چاکەکار بە چاکەکانیەوە خەریکە، خراپەکاریش بە تازەکردنەوەی پۆشاکەکانی و خراپەکانیەوە خەریکە.

**٣٤) هاوڕێیەتی خەڵک:**

هەرچۆن دەتەوێت هاوڕێیەتی خەڵك بکەیت، بەو شێوەیە بکە، چونکە دڵنیابە ئەوان بەو شێوەیەی تۆ هاوڕێیەتیان دەکەیت هاوڕێیەتیت دەکەن.

**٣٥) بەرگری لەخۆ:**

ئەی نەوەی ئادەم زاڵ ببە بەسەر ناخی خۆتدا و، لەغاوی بگرە و ڕامی بکە لەسەر چاکەکردن و خوداناسی، چونکە کەتۆ چوویتە نێو ئاگر ئەوە دوای ئەوە هەرگیز جوبران ناکرێتەوە و چارەسەر ناکرێت.

**٣٦) بێ دەنگی:**

گێڕانەوەو باسکردنی هەواڵی خێر و چاك باشترە لە بێدەنگی، بێدەنگی باشتر و خێرترە لە گێڕانەوە و باسکردنی هەواڵ و وتەی خراپ.

**٣٧) ڕازی بوون بەنارەوا:**

تەنها پیاوێك وشترەکەی کوشت، کەچی خودا هەموو قەومەکەی تووشی سزاکرد، لەبەرئەوەی ئەوان لەبەرامبەریدا ڕەزامەندیان دەربڕی و ڕازی بوون بەکارەکەی.

### ٣٨) خۆبەکەم نواندنی درۆ:

کەسانێك هەن خۆ بەکەم نواندنیان لەپۆشەکەکانیاندایە، نەك لە سنگیاندا، کەلەڕاستیدا پێویستە خۆبەکەم نواندنیان لە دڵیاندابێت.

### ٣٩) خۆبەکەم نواندنی ڕاستی:

ئەوەیە کە لەماڵەکەت دەربچیتە دەرەوە، هەر کەسێك ببینیت، وای سەیربکەیت کە فەزڵی هەیە بەسەرتەوە.

### ٤٠) دان بەخوداگرتن:

بڕوادار دان بەخۆداگرە ئەگەر نەفامیشی لەگەڵ بکرێت، ئەو نەفامی ئەنجام نادات، یان ئەگەر وتەی زفت و ناشیرینی پێ بڵێن ئەو بە وتەی شیرین وەڵام دەداتەوە. ئەمجا ئەم وتەیەی خودای خوێندەوە:

﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَـٰمًا﴾ الفرقان: ٦٣.

واتە: کاتێك نەزان و نەفامەکان بەوتەی ناشرین ڕووبەڕوویان ببنەوە و لەگەڵیان بدوێن، ئەوان بەوتەی شیرین وەڵامیان دەدەنەوە و وتەیەك ناڵێن گوناه بێت.

### ٤١) ئارامی و لەسەرخۆیی:

ئێوە ئەوەی کە ئارەزوومەندین‌و حەزتان لێیەتی بۆتان بەدەستنایەت، تا واز لەوە نەهێنن کە تامەزرۆین، وەئەوەی ئاواتە

خوازن بۆی بۆتان نایەتەجێ بەخۆڕاگری و ئارامگرتن نەبێت لەسەر ئەوەی کە حەزتان لێی نییە وە بێزتان لێی دێتەوە.هەروەها وتوویەتی:

خودای ڕەحمەتی خۆی برێژێت بەسەر ئەو کەسەدا حەق و ڕاستی دەزانێت و دەناسێت، ئەمجا ئارام دەگرێت لەسەر جێبەجێکردنی و گەیاندنی، یان بەرگری کردن لێی.. کەسانێك هەن حەق و ڕاستیان بەباشی ناسیوە و زانیوە، بەڵام هەڵچون و شلوێ بونیان چاویانی لەئاستی کوێرکردووە، جالەبەرئەوە نەخاوەن حەق بەمافی خۆی گەشتووە و، نەماف خۆرو حەق پشتگوێ خەریش بەو تاوانە پەشیمان بووەتەوە.

خۆتان بپارێزن لە شوێنکەوتنی هەوا و هەوەسی گومڕاکەر، ئەوە سەرجەمیان دوورکەوتنەوەیە لەزاتی ئەڵلا هەروەها سەرئەنجامی گومڕاییە، کۆتاییەکەی ئاگری دۆزەخە، شوێنکەوتن و ئارام نەگرتن لەسەر دوورکەوتنەوە لێی بەدبەختی و ڕۆژ ڕەشیە، هەر کەس توشی ببێت گومڕای دەکات، ئەوەش کە گومڕابوو سەرئەنجامی فەوتان و لەناوچوونە.

## ٤٢) حەسودی بردن:

لەکەسی حەسود بەدەر ستەمکارێکم نەدیوە کە زۆر لە ستەملێکراو بچێت، حەسود هەمیشە لە هەناسە هەڵکێشانی بەردەوام و، پەژارەیەکی بێ دابڕان و، دڵتەنگیەکدایە کە کۆتایی نایەت و تەواونابێت.

## ٤٣) غەیبەتکردن:

سوێند بەخودا غەیبەتکردن خێراتر کار دەکات لەوێرانکردن و هەڵتەکاندنی دینی بڕوادار، لەتووش بوونی جەستەی بەنەخۆشی خۆرە ((شێرپەنجە)) کەچۆن جەستەی دادەڕزێنێت.

ئەی نەوەی ئادەم: بەڕاستی تۆ ناگەیتە حەقیقەتی باوەڕ هەتا وات لێنەیەت شورەیی لەیەکێك نەگریت کە لەخۆت دایە، هەروەها هەتا دەست نەکەیت بەچاککردنی شورەییەك کە لەخودی خۆتدایە، جا ئەگەر ئەوەت کرد، ئیتر دڵنیابە بەڕاهێنانی خودی خۆتەوە خەریك دەبیت لەسەر گوێ ڕایەڵی و ، دوورکەوتنەوە لە شوورەیی. خۆشەویستترینی بەندەکانیش لەلای خودا ئەوانەن.

## ٤٤) درێژەپێدانی هیوا:

هەر بەندەیەك درێژەی دا بە هیوا و پشتی پێ بەست، ئەوە بێگومان کار پشتگوێ دەخات و لەدەستی دەدات.

### ٤٥) پیاوان:

پیاوان سێ جۆرن:

پیاوێك هەیە وەك خواردن وایە، وازی لێ ناهێنرێت.

جۆری دووەم: وەك دەرمانە، سات سات نەبێت پێویستت پێی نییە.

جۆری سێ یەم: ئەو پیاوەیە وەك دەرد وایە، هەرگیز پێویستت پێی نییە.

### ٤٦) گریانی حەسەن:

((حمزة الأعمی)) وتی: لەماڵەوە چوومە خزمەتی حەسەن بینیم دەگریا، لەدوای ئەوە هاتمەوە خزمەتی نوێژی دەکرد، سەرنجم دا بەئاشکرا گوێبیستی گریان و هەنسکی بووم، ناچار ڕۆژێکیان پێم وت: بەڕاستی جەنابت زۆر دەگریت چی وات لێدەکات زۆر بگریت؟!

ئەویش وتی:

ئەی کوڕی خۆم! بڕوادار ئەگەر نەگری ئەبێت چی بکات؟

ئەی کوڕی خۆم، گریان نزایە بۆ بەدەست خستنی ڕەحمەتی پەروەردگار، جا ئەگەر توانیت بەدرێژایی تەمەنت بگریت ئەوە بگری، بەڵکو خودای باڵادەست ڕەحمت پێبکات، ئەوجا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاربیت.

٤٧) پێکەنین:

پێکەنینی زۆری بڕوادار بێ ئاگابیە لە دڵیدا..

پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێت.

٤٨) نەخۆشی یاد خستنەوەیە:

حەسەنی بەسری ڕۆژێك سەردانی نەخۆشێکی کرد بینی چاك بوەتەوە، پێی وت:

ئەی برا، خودا بەو نەخۆشیەت یادی کردوویت، دەتۆش یادی بکەرەوە، کە شیفاشی پێ بەخشیویت چاك بویتەوە سوپاسی بکە..

ئەمجا وتی: بەڕاستی نەخۆشی زللەیەکی میهرەبانیە لە پەروەردگارێکی بەخشندەی میهرەبانەوە، جا نەخۆش پاش چاکبوونەوەی یان دەبێتە ئەسپێکی کەحێلەی تیژڕەو و ڕاهێنراو، یان گوێ درێژێکی شەلی سەقەت و بێ کەڵك.

٤٩) سەرەمەرگ:

حەسەن پیاوێکی بینی لەسەرە مەرگدا بوو، هەر هاواری بەخشینی هەرچی ماڵ و داراییەتی بوو، جا حەسەن - خوا لێی ڕازی بێت - وتی:

کەسێکی ئاوەها چاکتر وابوو لەسەرەتای ژیانییەوە دونیا نەویست و بەخشینەر بووایە، چاکتر وابوو لەسەرەتای ژیانیەوە لەکۆتاییەك بترسایە و لەخەمیدابووایە.

### ٥٠) مەرگ:

مەرگ وابەستەیە بەگەردنتانەوە و، دونیاش لەدواتانەوە دەپێچرێتەوە.

جگە لەمردن هیچ شتێکم نەدیوە جێگەی دڵنیایی بێت و هیچ گومانی تێدا نەبێت و، لەو ڕووەوە لەمردن بچێت.

### ٥١) هەڵگرانی قورئان:

هەڵگری قورئان سێ کەسە:

کەسێك شتومەك هەڵدەگرێت لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەیگوێزێتەوە، بەو شتومەکە چی بوویت لە خەڵکی ئەو شوێنە بەدەستی دەخات.

کەسێکی تر پیتو وشەکان لەبەردەکات، بەڵام سنورەکانی تێدەپەڕێنێتو پەیڕەویان ناکات، بەوەی لەبەریەتی سەرنجی فەرمانڕەوایان بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت و، بەهۆیەوە خۆی بەسەر خەڵکی شار و وڵاتەکەیدا ڕادەدات، ئەم شێوەیە لە هەڵگرانی قورئان زۆرن.

کەسی سێهەم، قورئان دەخوێنێتەوە، بەڕاستی بەهۆیەوە دەرمان لەسەر دەردی دڵی دادەنێت، شەو بەشەونخونی لە خزمەتیدا بەسەر دەبات، چاوەکانی بەردەوام بە فرمێسکە، خوشوعو ملکەچی لە

خزمەتیدا دەستی بەسەریدا کێشاوە، شکۆمەندی باڵاپۆشیەتی، سوێند بەخودا نموونەو شێوەی ئەمە لەهەڵگرانی قورئان زۆر زۆر کەمترە لە کبریتی سوور، بەهۆی ئەوانەوە خودای باڵادەست باران دەبارێنێت، هەروەها سەرکەوتن دادەبەزێنێت و، بەڵا و نەهامەتیەکان لادەبات.

## ٥٢) شەرع زان ((الفقیە)):

(فەرقەدی) دەربارەی شتێك پرسیاری لە حەسەن کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە، پاش ئەوە فەرقەد وتی: ئەی ئەبا سەعید چی یە لەڕاستیدا شەرع زانان موخالەفەی تۆ دەکەن، ئەویش ـ خوا لێی ڕازی بێت وتی:

دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی فەرقەد، ئایا تۆ بەچاوی خۆت شەرع زانێکت بینیوە؟!

شەرع زان: لەدونیادا دونیا نەویستە، هەمیشە تامەزرۆ و ئارەزوومەندی دواڕۆژە، بیناو شارەزایە بە دینەکەی، بەردەوامە لەسەر بەندایەتی کردنی پەروەردگاری، خۆپارێزە لەناموسی موسڵمانان، دەست پاکە لەماڵ و سامانیاندا، بەردەوام ئامۆژگاری کارێکی دڵسۆزە بۆیان.

## ٥٣) زانایان:

زانایانی دوێنێ بەزانستەکەیان لە ئەهلی دونیا بێ باك بوون، هەر بەو زانستەشیان قەزاوەت و دادوەریان بەسەر ئەهلی دونیادا دەکرد..

بەشێوەیەك کە ئەهلی دونیا بەدونیای خۆیان ئەو قەزاوەتو دادوەریەیان بۆ نەدەکرا..

ئەهلی زانست دونیای خۆیان دەبەخشی لە ڕێگای بەخزمەتگەشتنی زانایاندا بۆ سودمەندبوون لە زانستەکەیان، بەڵام ئەمڕۆ زانایان زانستەکەیان دەبەخشنە ئەهلی دونیا بۆ بەدەستخستنی دونیایان..

ئەهلی دونیاش پشتیان تێ کردوون‌و، دەستیان کۆتا کردووە لە گەڕان‌و هەوڵدان بەدوای زانستەکەیاندا لەبەر خراپی شوێن و هەڵسوکەوتیان لەنێویاندا، کەڕۆژانە بەردەوام دەیان بینن.

## ٥٤) زانایان و دەرگای فەرمانڕەوایان:

حەسەن لەماڵەکەی هاتە دەرەوە، بینی هەندێ لە خوێنەران و شارەزایانی قورئان لەبەردەم ماڵی کوڕی هوبەیرەدا[١٢] وەستاون، ڕووی تێکردن و پێی وتن: چی یە وا لێرەدا دانیشتوون، دەتانەوێت بچنە لای ئەو قیزەون‌و پیس و چەپەڵانە؟ سوێند بەخودا دانیشتن لەگەڵ ئەوانەدا

---

[١٢] عومەری کوڕی هوبەیرە، لەلایەن یەزیدی کوڕی موعاویەوە کراوەتە والی ((فەرمانڕەوای)) عێراق.

دانیشتن نیە لەگەڵ پیاوچاکاندا، دەی هەستن بڵاوەی لێ بکەن، خوا بڵاوی بخاتە نێوان دڵ و جەستەکانتان.

دەتانبینم پێڵاوەکانتان لەپێ کردووە و، پۆشاکتان لێ کردووە بەلاداو سەرتان داهێناوە بۆ چوونەلای ئەو پیس و پۆخڵانە، بەڕاستی ئابڕوی خوێنەران و زانایانتان برد و ڕسواتان کردن، خوا ڕسواتان بکات، سوێند بەخودا ئەگەر ئێوە بێ باك بونایەن لەوەی لەلای ئەوانە، ئەوان هەوڵیان دەدا و تامەزرۆی ئەوە دەبوون کە لەلای ئێوەیە، بەڵام ئێوە هەر لە هەوڵ و کلکەسوتەکیدان بەدەوری ئەواندا بۆ بەدەستخستنی ئەوەی لەلای ئەوانە، لەبەرئەوە ئەوان لەئێوە بێ باکن لەوەی کە لەلاتانەو چاویان لەسەری نییەو، بەسووکی و ڕسوایش سەیرتان دەکەن.

### ٥٥) دانیشتن لە خزمەتی زانایاندا:

ئەگەر دانیشتیت لە خزمەتی زانایاندا، ئامادەبە لەسەر ئەوەی فێرببیت کەچۆن گوێ بیستیان دەبیت، سوربە لەسەر ئەوەی لێیانەوە فێرببیت کە چۆن دەدوێیت. کە ئەوانەت ئەنجامدا، هەوڵبدە جوان گوێ ڕاگرتن فێرببیت، وەفێری ئەوە ببە کە هەرگیز وتە بە کەس نەبڕیت.

**٥٦) ژیری:**

خودای باڵادەست ئەگەر بەلوتفی خۆی جۆرێك ژیری بەکەسێك بەخشی بێت، بێگومان ڕۆژێك بەهۆی ئەو ژیریەوە کاری ئاسان دەبێتو سەرفراز و ڕزگار دەبێت.

**هەروەها وتوویەتی:**

دەگونجێت کەسێك زانا بێت، بەڵام نابێت بەهۆی ئەوەوە کە زانایە خوداپەرست بێت، دەگونجێت کەسێك خوداپەرستێکی یەکلاکەرەوە بێت، بەڵام ناگونجێت وابیینی مادام ئەو کەسە خوداپەرستێکی یەکلاکەرەوەیە دەبێت ژیریش بێت.

**٥٧) سەرمایەی بڕوادار:**

سەرمایەی بڕوادار دینەکەیەتی، لەهەرکات و شوێنێکدا دینەکەی لەدەست دا، خۆشی لەدەست دەدات، کە دینەکەی نەما خەڵکی متمانەیان پێی نامێنێت. لەدوای کۆچکردنیشی ناوبانگی باشەی نامێنێت.

**٥٨) زانست و خوداپەرستی:**

کارکردن و خوداپەرستی بەبێ زانست، وەك ڕێبوارێکە بەبێ ڕێگا ڕێ بەڕێ بکاتو زیاتر کار و خوداپەرستیەکان خراپتر دەکات لەوەی چاکیان بکات.

تێبکۆشە بۆ بەدەستهێنانی زانستی تەواو، دڵنیابە ئەوە زیان ناگەیەنێت بەوازهێنان و پشتگوێ خستنی هەندێ خوداپەرستی..

هەوڵبدە بۆ ئەنجامدانی خوداپەرستی یەکان بەشێوەی پێویست و زانستیانە، دڵنیابە ئەوە زیان ناگەیەنێت بەپشتگوێ خستن و وازلێهێنانی هەندێ زانست، ئەوەتا کۆمەڵە کەسانێك[١٤] بەدوای خوداپەرستی کەوتن و بەئەنجامدانی خۆیان خەریك کرد بەبێ زانست، وازیان لە زانست هێنا و پشتیان تێ کرد، سەرئەنجام شیر بەدەستەکانیان هەڵیان کوتایە سەر ئوممەتی موحەممەد ﷺ کوشتاریان کردن، دەی خۆ ئەگەر بەدوای زانست بکەوتنایە و زانست فێرببونایە و، لەڕێگەی زانستەوە کار و خودا پەرستیان ئەنجامبدایەت، بێگومان توشی ئەوە نەدەبوون کە ئەنجامیان دا.

### ٥٩) کردار ترازاوە:

خەڵکی بەکردارەکانیان سەیربکەن و متمانەیان پێ بکەن، واز لە وتەکانیان بهێنن، چونکە خودا هیچ وتەیەك واز لێ ناهێنێت و حسابی لەسەر ناکات، تا بەکردار ڕاستی و درۆیی ئەو وتەیە نەسەلمێت.

---

[١٤] مەبەستی لە خەواریجەکانە.

### ٦٠) چاکەکردن و ترس و بیم:

سوێند بەخودا پێشینان گوێڕایەڵی و خوداپەرستی تەواویان ئەنجامداو، تێیدا خۆیان ڕەتاندو تێکۆشان، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسان لەوەی کە بدرێتەوە بەسەریانداو لێیان وەرنەگیرێت، لەڕاستیدا بڕوادار کۆکاری چاکەکردن و ترسە، دووڕووش کۆکاری خراپەکردن و دڵنیاییە.

### ٦١) ترس و ئومێد:

پێویستە کە ترس زاڵ بێت بەسەر ئومێد دا، چونکە بێگومان ئەگەر ئومێد زاڵ بێت بەسەر ترسدا ئەوە دڵو دەروون خراپ دەبێت.

هەروەها وتوویەتی:

جێگەی سەرسوڕمانە بۆ کەسێك لەسزا بترسێت و دەست لە خراپە کۆتا نەکات، هەروەها بۆ کەسێك ئومێدی پاداشتی هەبێت و کاری بۆ نەکات.

### ٦٢) هێز و لاوازی:

هەرکەس بەهێز و توانایە با بیخاتە گەڕ لە گوێڕایەڵی و پەرستنی زاتی ئەڵڵا دا وە ئەوەش کەلاواز و بێ توانایە بالەسەر پێچی زاتی ئەڵڵا دەست کۆتا بکات و وازبهێنێت.

### ٦٣) پشتگویٚ خستن:

ئەی نەوەی ئادەم: دەستم بەدامانت تۆ و پشتگویٚ خستن، چونکە بەڕاستی تۆ وابەستەی بە ئەمڕۆتەوە نەك بە سبەینێوە، جا ئەگەر سبەینیٚ بۆ تۆ بوو، ئەوا ژیرانە و دانایانە تێیدا هەڵسوکەوت بکەو کاری تێدا بکە هەرچۆن دوێنیٚ ژیرانەو دانایانە کارو هەڵسوکەوتت کرد، خۆ ئەگەر سبەینیٚ بۆ تۆ نەبوو، ئەوە بێگومان پەشیمان نیت لەوەی ئەمڕۆ لەدەستت داوە یان پشتگوێت خستووە.

### ٦٤) گوناهەکانت باڵبەستی کردویت:

پیاوێك وتی بە حەسەن ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ: ئەی ئەبا سەعید: دوێنیٚ شەو ویستم نوێژبکەم کەچی نەمتوانی، تۆ بڵێیت هۆی چی بێت.

حەسەن وتی: گوناهەکانت باڵبەستیان کردویت.

### ٦٥) بەکردار نزا بەرزدەبێتەوە:

کرداری چاك وتەی جوان و شیرین بۆلای خودا بەرزدەکاتەوە، خۆ ئەگەر وتە جوان و شیرین بێت و کردار خراپ بێت، ئەوە بەبیٚ گومان وتەکە دەدرێتەوە بەسەر کردارەکەدا، هەمیشەش مرۆڤ کرداری شایانترە لەوتەی.

### ٦٦) نەفام بە نەخۆش دادەنێن:

حەسەنی بەسری ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە: ﴿ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنًا﴾ الفرقان: ٦٣.

واتە: بەندە تایبەتیەکانی خودا ئەوانەن بەویقار و نەرم و نیانی بەسەر زەوی دا دەڕۆن (بێ لوت بەرزی و کەشخە و فیزکردن).

ئەمجا وتی: بڕوادارانی ڕاستەقینە ملکەچن، سوێند بەخودا بینین و بیستن و ئەندامەکانیان ملکەچن، بەشێوەیەك نەفام بە نەخۆشیان دادەنێت، سوێند بەخودا ئەوان هیچ نەخۆشیەکیان نییە، بەڵکو لەڕاستیدا ئەوان خاوەن دڵەکانن، ئەوەندەی ترس و بیم چووەتە نێو دڵی ئەوانەوە نەچووەتە نێو دڵی کەسانێك جگە لەوان، هەر ئەوەو ئاگابوونیانە لەدوارۆژ کە لەدونیا و لەزەت و جوانیەکانی دونیا قەدەغەی کردوون.

ئەوان دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی غەمو پەژارەی لێ وەلاناین ـ سوێند بەخودا غەم و پەژارەی خەڵکی ئەوان غەمبار ناکات، لەناخ و دەرونیاندا ئەوە بەگرنگ و گەورە ناگرن کەچۆن بەهەشت بەدەست بخەن، ترس و بیمیان لەئاگری دۆزەخ دەیان گریێنێت و فرمێسکیان پێ هەڵدەڕێژێت.

وەبەڕاستی ئەوەی خودا نەکاتە پەناو پشتیوانیو خۆی شکۆمەند نەکات بەشکۆمەندی خودا ئەوە دڵ و دەروونی بە هەناسە هەڵکێشان هەلا هەلا دەبێت بۆ دونیا، ئەوەی بەهرەی خودا تەنها لەخواردن و خواردنەوەیدا بیبینێت ئەوە بێگومان کرداری کەم دەبێت، هەر لە دونیادا سزا یەخەی دەگرێت.

### ٦٧) ئاسانکاری و سوککردن:

ئەم دینە دینێکی جێگیر و دامەزراوە، هەر کەس خۆڕاگر نەبێت لەسەر ئەنجامدانی ئەوە وازی لێدەهێنێت و پشتی تێدەکات، لەڕاستیشدا ئەنجامدانی حەق و پەیڕەوی کردنی قورس و بارگرانیە، مرۆڤیش لاوازە، وتراوە:

با هەر یەکێك لەئێوە بارێك بگرێتە دەست و جێبەجێی بکات کە لەتوانایدایە، چونکە بەڕاستی ئەو نازانێت کەی دەمرێت، وە بێگومان بەندە ئەگەر توند و تیژی هەڵبژارد و، خۆی خستە ژێر بارێك کە لەتوانایدا نەبوو، ئەوە پێدەچێت هەموو کارەکەو ئەوەی وابەستە بەو کارەوە وازلێ بهێنێت، هەتا وا دەبێت فەرزەکانیش جێبەجێ نەکات، بەڵام خۆ ئەگەر بەندە ئاسانکاری و سوککردنی پەیڕەوکرد و، چووە ژێرباری کارێك کە لەتوانایدا بوو، جائیتر خوداپەرستی بێت یان هەر

کارێکی چاکی تر، ئەوە بەڕاستی کەسێکی ژیر و دانایە، یان حەسەن وتوویەتی ئەو کەسە لەزۆرترینی کارکارانە.

### ٦٨) یادکردنەوەی بەهرەکان:

زۆر یادی بەهرەکانی خودا بکەنەوە، چونکە بەڕاستی یادکردنەوەیان، سوپاس و ستایشکردنی خودایە لەسەر ئەو بەهرانە.

### ٦٩) پاداشتی ئەوەی کاری پێدەکات:

هەر کەس لەئێوە لەکرداری چاکەدا دەتوانێت ببێتە پێشەنگ و پێشەوا بۆ خاو و خێزان و کەسوکار و، خۆشەویستانی و، کەسانی دیکەش بابێت، چونکە هیچ شتێك نییە لەتۆوە وەربگیرێت، یان لێتەوە خەڵکی فێری بن، تۆ بەشت تێیدا نەبێت.

### ٧٠) گۆشەگیری بۆ خوداپەرستیو جێبەجێکردنی ئاتاجی خەڵک:

حەسەن چوو بۆلای ((ثابتی بەنانی)) تاپێکەوە بچن بۆ جێبەجێ کردنی ئاتاجی پیاوێك.

ثابت وتی: گۆشەگیری خوداپەرستیم (ئیعتکافم بەستوە)،

حەسەنیش - خوا لێی ڕازی بێت - فەرمووی: بەڕاستی ئەگەر بتوانم پێویستی برایەکی مسوڵمانم جێبەجێ بکەم بەلامەوە خۆشترە لە گۆشەگیری خوداپەرستی یەك ساڵ.

### ٧١) فەرمانکردن بەچاکە:

ئەگەر تۆ فەرماندەر بوویت بەچاکە، لە هەموو ئەو کەسانەی وابەستن بەچاکەوە و پەیڕەوی دەکەن، تۆ زیاتر وابەست بە پێوەیو پەیڕەوی بکە ئەگینا تیادەچیتو کەس بەگوێت ناکات.

هەروەها ئەگەر تۆ نەریّ کار و قەدەغەکار بوویت لەخراپە، ئەوا دەبێت تۆ لە هەموو ئەوانەی لەو خراپە پشت هەڵدەکەن و وازی لیّ دەهێنن زۆر زیاتر پشت هەڵکەر و وازهێنەرتربیت ئەگینا تیادەچیت و کەس بەگوێت ناکات.

### ٧٢) زانست بۆ کارپێکردن:

ئەگەر کەسێك بچێت بەدوای فێربوونی بەشێك یان جۆرێك لەزانست و باش فێری ببێت، ئەمجا کاری پیّ بکات، ئەوە بۆ ئەو لەدونیا و ئەوەی لەدونیادایە باشتر و خێرترە، ئەگەر دونیا و ئەوەی لەدونیادا هەیەتی لەڕێگای بەدەست خستنی دواڕۆژیشیدا خەرجی بکات و بیبەخشێت.

### ٧٣) سزای زانا:

مالیکی کوڕی دینار ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وتی بە حەسەن:

سزای زانا چی یە؟

وتی: مردنی دڵە.

مالیك وتی: مردنی دڵ چی یە و چۆنە؟

ئەویش وتی: هەوڵدانە بەدوای دونیادا بەهۆی دوارۆژەوە ، واتە گۆڕینەوەی دوارۆژ بەدونیا..

**٧٤) ئامۆژگاری کردن و یادخستنەوە:**

شەیبان ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وتوویەتی: گوێبیستی حەسەن بووم دەیوت بەیەکێك لە هۆزی ((بەنی شوخەیر)): ئەی لاو بۆمان بدوێ و ئامۆژگاریمان بکە.

لاوەکە وتی: ئەی ئەبا سەعید، بەڕاستی من نەگەشتومەتە ئەو ئاستەی ئامۆژگاریتان بکەم.

حەسەن وتی: دەی کێ لە ئێمە گەشتۆتە ئەو ئاستە؟

لەڕاستیدا شەیتان ئاواتە خوازە کە خەڵکی بەبیانووی ئەوەی کە شایستەی ئامۆژگاری کردن و یادخستنەوەنین، واز لە ئامۆژگاری و یادخستنەوە بهێنن، سوێند بەخودا ئەگەر زاتی ئەڵڵا پەیمانی وەرنەگرتایە لەزانایان کەبەوەی دەیزانن و فێربوون خەڵکی ئامۆژگاری بکەن و فێریان بکەن، هەرگیز نەدەدواین.

**٧٥) خۆشەویستی زانست:**

فێربوونی بابەتێك لەزانست، بەلامەوە خۆشەویست ترە لەدونیا و لەوەی تیایدایە.

### ٧٦) دەست پێوەگیری:

موعەللای کوڕی زیاد - خوا لێی ڕازی بێت - وتی: گوێبیستی حەسەن بووم سوێندی بەخودا دەخوارد و دەیوت: دەست پێوەگر هەرگیز هەژار نابێت و هەست بەهەژاری ناکات.

### ٧٧) ئامۆژگاری بەکردار:

ئەی بڕوادار: بەکردارت ئامۆژگاری خەڵك بکە نەك بەوتە و لێدوانت.

### ٧٨) خوانی ڕەواو بەتام:

دوو خوان و خواردن ڕەوا و بەتامن: یەکێکیان ئەوەیە کەسێك بەدەستی خۆی دابینی دەکات، ئەوی دیکەیان ئەوەیە کەسێك بەکۆڵە پشتی دابینی دەکات.

### ٧٩) خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانن:

باشی فەزڵ و گەورەیی کۆچکەران بناسن و بزانن و شوێن ئاکار و ڕەفتاریان بکەون، هەروەها دەستم بەدامانتان نەکەن شوێن ئەوە بکەون کە خەڵکی لەدینەکەیاندا دایان هێناوە، چونکە بەڕاستی خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانن.

### ٨٠) هەر کەس پەروەردگاری ناسی:

هەر کەسێك پەروەدگاری بەباشی ناسی ئەوە بێگومان خۆشی دەوێت، هەر کەسێك بەچاوی ژیری دونیای بینی ئەوە خۆدەگرێتەوە تیایدا، برِوادار شوێن هەواو گاڵتەو گەپ ناکەوێت تا بیٚ ئاگا نەبێت، وە ئەگەر بیری کردەوە غەمبار و دڵتەنگ دەبێت.

### ٨١) چوونە لای دەوڵەمەندان:

لەڕاستیدا کەسی واهەیە لەدەرگای دەوڵەمەند دەداو، لەسەر سفرە و خوانی ئامادە دەبێت، خواردنی باش دەخوات، دەی بەبیٚ گومان هەر بەوە دڵی دەگۆڕێت، جادەستم بەدامانتان نەکەن بچنە ماڵی زەنگینەکان و ئامادەی سفرە و خوانیان بن، چونکە دڵنیابن هەرکەس لەدەرگایان بدات و ئامادەی سفرە و خوانی ڕازاوەیان بێت، دڵی دەگۆڕێت و، ئەوەی لەدەستی خۆی دایە لای قیزەون دەبێت و بێزی لێدەکاتەوە.

### ٨٢) نەرمی و لەسەرخۆیی لەخۆشەویستی و بوغزدا:

خۆشەویستی و بوغز بەنەرمی و لەسەرخۆیی بنوێنن و ئەنجامبدەن، لەڕاستیدا کەسانێك توند و تیژی و زیادەڕەویان لەخۆشەویستی و بوغزدا بەکارهێنا تیاچوون و تووشی گرفت بوون، زیادەڕەوی و توند و تیژی لە خۆشەویستی و بوغز نواندندا نییە.

### ٨٣) ئاواتەکان:

ڕەحمەت و بەرەکەتی خوداتان لەسەر بێت ئەی بڕوادارینە، دەستم بەدامانتان نەکەن نزیکی ئاواتەکان بکەون، چونکە دڵنیابن هیچ کەسێك بەئاوات خواستن هیچ خێر و بێرێکی دونیا و دوارۆژی پێ نەبەخشراوە و بەدەستی نەخستووە.

### ٨٤) پووش و قەدی درەختێک:

ئەی نەوەی ئادەم، وریابە، پووشێك لەچاوی براکەتدا دەبینیت، کەچی قەدی درەختێك لەچاوی خۆتدا نابینیت و وازی لێ دەهێنیت، لەکاتێکدا کە بەرچاویشی گرتوویت.

### ٨٥) بەرتیل:

دڵنیابن ئەگەر بەرتیل لەدەرگاوە بێتە ژوورەوە، ئەمانەت و بەرەکەت لەکلاو ڕۆژنەوە[١٥] دەچێتەدەرەوە.

### ٨٦) خۆشەویستترین بەندەکان:

خۆشەویسترینی بەندەکان بەلای خوداوە ئەوانەن خودای باڵادەست لەلای بەندەکانی خۆشەویست دەکەن، لەسەر زەویدا بەئامۆژگاریەوە خەریك دەبن.

---

[١٥] کلاو ڕۆژنە لەکۆندا لەسەربان دەکرا وەك ڕووناکی ئێستا. ((وەرگێڕ)).

### ٨٧) خۆبەگەورەگرتن:

ئەی نەوەی ئادەم: چۆن خۆت بەگەورە دەگریت و خۆبەسەر خەڵکیدا ڕادەدەیت، لەکاتێکدا تۆ ئەوەی کە دووجار لەڕێگای میزەوە هاتویتەدەرەوە.

### ٨٨) مامناوەندیەتی ((الوسطية)):

خودای باڵادەست دینی ڕەوانەکردووە بەمام ناوەندیەتی بەبێ زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی کردن تیایدا.

### ٨٩) بەهرەی دونیا بۆ بڕوادارە:

بەهرەدارترین و خۆشترین ماڵ دونیایە بۆ بڕوادار، ئەوەش لەبەرئەوەی بەپێی کورتی تەمەنەکەی[١٦] کارێکی کەمی تیادا ئەنجامدەدات لەخوداپەرستی و چاکەو، ئەوجا توێشووی خۆی لێ مسۆگەر دەکات بۆ بەهەشت. وە خراپترین ماڵیشە بۆ بێ باوەڕ و دووڕوو، ئەوەش لەبەرئەوەی شەوان و ڕۆژانی لەگاڵتەو گەپ و خراپە و ڕابواردن تیادا بەسەر دەبات، ئەمجا توێشوەکەی لێی بەرەو دۆزەخ بەڕێی دەکات.

---

[١٦] مەبەست ئەوەیە هەرچەند تەمەنی درێژ بێت هەر کورتە چونکە مردنی لەدوایە.

### ٩٠) داوای لێبورد:

((إبن صبيح)) وتوویەتی: پیاوێك لە خزمەتی حەسەندا سکاڵای وشکە ساڵی کرد، ئەویش پێی وت: داوای لێبوردن لەخودا بکە ((أستغفر الله)).

پیاوێکی تر پێی وت: ئەی حەسەن نزام بۆ بکە خودا کوڕێکم پێ ببەخشێت.

ئەویش پێی وت: داوای لێبوردن لەخودا بکە ((أستغفر الله)).

کەسێکی دیکە سکاڵای وشکبوونی باخ و بێستانەکەی لاکرد.

ئەویش پێی وت: داوای لێبوردن لەخودا بکە ((أستغفر الله)).

ئێمەش هەرلەو بارەوە زۆرمان پێ وت، ئەویش وتی: خودا دەفەرمووێت:

﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾﴾ نوح.

واتە: ئەوسا پێم وتن: داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگارتان بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێبوردەیە، ((ئەمجا گەر وابکەن)) بارانی خوڕەم و لێزمەتان بۆ دەبارێنێ، وەسامان و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێ، هەروەها باخ و باخاتی زۆرتان پێ دەدات، وە جۆگە و ئاوی زۆرتان دەداتێ.

### ٩١) دڵ ڕەقی:

کەسێك بەحەسەنی وت: ئەی ئەبا سەعید بەڕاستی من سکاڵای دڵڕەقی خۆمت لادەکەم، چی بکەم؟

ئەویش وتی:

نزیکی بخەرەوە لەکۆڕی یادکردنەوە، یانی ڕای بهێنە لەسەر یادکردنەوە و، هاودەمی ئەوە بکە کە یاد دەکاتەوە.

### ٩٢) داواکردنی پێویستی:

حەسەن وتوویەتی: بەڕاستی ئەگەر بڕوادار داوای ئاتاجێکی کرد و بۆی ڕەخسا و ئاسان بوو بۆی، پێویستە بەلوتفی خودای بزانێت و، سوپاس و ستایشی لەسەر بکات، خۆ ئەگەریش بۆی نەڕەخسا و بۆی ئاسان نەبوو، پێویستە وازی لێ بهێنێت و خۆی بەدوایدا شەکەت نەکات.

### ٩٣) ئەوەی شەیتان ئاواتە خوازیەتی:

حەسەن بەمەطرەڤ کوڕی عەبدوڵڵای وت: ئامۆژگاری هاوەڵەکانت بکە.. ئەویش وتی: بەڕاستی دەترسم ئەوەی کە دەیڵێم خۆم نەیکەم.

حەسەن وتی: خودا بەزەیی پێتابێنێتەوە، کام لەئێمە ئەوە بەتەواوی دەکات کە دەیڵێت؟، شەیتان ئاواتە خوازە لەوێوە دەست بووەشێنێت، کەکەس فەرمان نەکات بەچاکە و نەهیێ نەکات لەخراپە.

## ٩٤) ڕەوانبێژی:

پیاوێك بەحەسەنی وت:

ئەی ئەبا سەعید دەربارەی دونیا چی دەڵێیت؟

ئەویش وتی: دەبێت دەربارەیماڵێك چی بڵێم کە حەڵاڵ و ڕەواکانی حسابی لەسەرەو، حەرام و قەدەغەکراوەکانیشی سزای لەسەرە.

پیاوەکە وتی: سوێند بەخودا هیچ وتەیەکم کورت و پوخت وەك ئەو وتەیەی تۆ نەدیوە.

حەسەن وتی: بەڵێ بەڵکو وتەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەو وتەیەی من کورت و پوخت و ڕەوانترە، کاتێك فەرمانبەرەکەی لەویلایەتی ((حمص[١٧])) نامەیەکی بۆ نووسی: کە دیواری شارەکە خەریکە دەڕوخێت لەبەرئەوە پێویستی بەچاك کردن هەیە. چاوەڕێی فەرمانتین.

عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ بۆی نووسی:

"بەدادپەروەری شارەکەت بپارێزە و قایمی بکە، لەستەم خاوێنی بکەوە، مەترسیەکانی لەسەر مەهێڵە، ئەوجا ئومێدی سەلامەتی بۆ بخوازە و لێی دڵنیابە".

---

[١٧] شارێکی سوری کۆنە مەڵبەندی پارێزگاری حومصە، مزگەوتی خالیدی کوڕی وەلیدی بەناوبانگی تێدایە. ((وەرگێڕ).

### ٩٥) ئارامگرتن لەسەر نەهامەتی:

ئەو خێر و چاکەیەی هیچ شەڕ و خراپەی تێدانییە، سوپاس گوزاریە لەسەر بەهرەکان و لەش ساغی، هەروەها ئارامگرتنە لەکاتی هاتنی نەهامەتیەکان و تاقیکردنەوەکاندا، لەڕاستیدا چەندها کەس دەبینرێت لەوانەی بەنەهامەتیەکەوە گیرۆدەیەو ئارامگرنییە لەسەری، ئەم دووانە بەڕاستی پاداشتی سوپاسگوزاری لەسەر بەهرەکان و، ئارامگرتن لەسەر نەهامەتی و توشهاتەکان لەدەست دەدەن.

### ٩٦) بەرەبەیان:

ئێوە ڕۆژتان کردۆتەوە تێیدا ئەجەلتان کەمی کردووە، هەر کارێکیشتان ئەنجامدابێت تێیدا پارێزراوە لەلای خودا، مەرگ وا لەگەردنتاناو، ئاگر وا لەنێو دەستەکانتانا، ئەوەی دەیبینن سوێند بەخودا تێ دەپەڕێت و دەڕوات و نامێنێ، دەی کەوایە لەهەموو شەو و ڕۆژێکدا چاوەڕێی قەزا و فەرمانی زاتی ئەڵڵا بن، هەروەها با هەر کەسێك سەیر بکات و سەرنج بدات چی بۆخۆی پێش خستووە.

### ٩٧) سێ هەناسە هەڵکێشان:

هیچ کەسێك نییە لەنەوەی ئادەم لەکاتی گیان دەرچوونیدا سێ هەناسەی پەشیمانی هەڵنەکێشێت:

یەکەمیان: لەڕاستیدا لەبەرئەوەی ڕای نەبواردووە بەوەوە کە کۆی کردۆتەوە و ناویەتە سەریەك.

دووەمیان: ئەوەی ئومێد و ئاواتی بوو بۆی نەهاتە دی.

سێ یەمیان: توێشووی باشی ئامادەنەکردووە بۆئەوەی هاتە سەری و پێشی پێ گرت.

### ٩٨) ڕەوشت جوانی:

حەقیقەت و بنەمای ڕەوشت جوانی: ئەنجامدان و ڕاگەیاندنی چاکەو، وازهێنان و نەرێ کردنە لەخراپەو، ڕووخۆشی یە.

### ٩٩) نموونەی دونیا:

دونیا هەمووی لەسەرەتایەوە تا کۆتاییەکەی نموونەی کەسێکە خەوێکی باش بکات، جا لەخەوەکەیدا خەوێکی خۆش ببینێت و ئەمجا کوتوپڕ بەخەبەربێت.

### ١٠٠) یادکردنەوە پێش نوستن:

هەر موسڵمانێك کاتێك دەچێتە سەر جێگاکەی بۆ نووستن و پشوودان، گەر یادی خودا بکات ئەوە سەرجێگاکەی بۆ دەبێتە مزگەوت بۆ بەندایەتیکردنی زاتی ئەڵلا ، هەروەها لەلای زاتی ئەڵلا لەیادکەرەوان ((المذاکرین)) تۆماردەکرێت.

### ١٠١) پێگەی زانست:

خۆڕاگری و دان بەخۆداگرتن وەزیری زانستە، نەرمونیانیش باوکیەتی، خۆبەکەم نواندنیش پۆشاکی یەتی.

### ١٠٢) شکۆمەندی زانست:

حەسەن ڕۆژێك کوڕەکەی بەجێهێشت، پیاوێك لەخەڵکی خۆراسان کە ئامادەی کۆڕەکەی بوو، ڕوخسەتی لێوەرگرت بچێتە خزمەتی، کاتێك ڕوخسەتی دا و ئامادەی خزمەتی بوو، کیسەیەکی خستە بەردەستی کە پێنج هەزار درهەمی تێدابوو، هەروەها دە پارچە پۆشاکیش کە لەمەرزی تایبەتی خۆراسان دروستکرابوون.

حەسەن – خوا لێی ڕازی بێت – پێی وت: ئەوە چی یە؟

کابراش وتی: ئەی ئەبا سەعید، ئەمە خەرجی یەو، ئەمەی دیکەش پۆشاکە.

حەسەن پێی وت: خودا سەلامەتت کات، خەرجی پۆشاکەکەت هەڵبگرەوە بۆخۆت، ئێمە پێویستمان پێیان نییە، هەر کەس ئامادەی کۆڕی من ببێت بۆ ئەو مەبەستە و، هەرکەسیش نموونەی ئەوە وەربگرێت، لەڕۆژی ڕەستاخێزدا کاتێك بەخزمەتی زاتی ئەڵڵا دەگات شایانی هیچ پاداشت و لوتفێکی خودا نییە.

### ۱۰۳) هاودەمی چاك:

هاودەمی و هاوڕێیەتی کەسێك بکە بەکردارەکانی لەگەڵت بدوێ و بت دوێنێت، نەکەی هاودەمی و هاوڕێیەتی کەسێك بکەیت بە وتەکانی لەگەڵت بدوێ و بت دوێنێت.

### ۱۰٤) زانایان و کارکردن:

هەر شتێکتان دەوێت فێری ببن، فێرببن، سوێند بەزاتی ئەڵلا ، خودا لەسەری پاداشتان ناداتەوە هەتا کاری پێ نەکەن، بۆیە دەبینی نەفامو کەودەنگەکان هەموو هەم و غەمێکیان قسەگێڕانەوە و قسەی زلە، زانایانیش هەموو غەمێکیان چاودێری و پارێزگاری و گرنگی پێدانە.

### ۱۰۵) دراوسێ یەتی چاك:

چاك دراوسێ یەتی ئەزیەت و ئازار نەگەیاندن نییە، بەڵکو چاك دراوسێ یەتی خۆڕاگری و دان بەخۆداگرتنە لەبەرامبەر ئەزیەت و ئازار و خراپی دراوسێدا.

### ۱۰٦) باشترینی شتەکان:

زانست و زانیاری باشترین کەلەپورە، ئەدەب جوانترینی ڕووەکانە، خۆپارێزی باشترین توێشووە، خواپەرستی بەسوودترین شمەکە، ژیری باشترین چاودێرە، ڕەوشت جوانی باشترین هاودەم و هاوڕێ یە،

خۆڕاگری و دان بەخۆداگرتن باشترین وەزیرە، قەناعەت گەورەترین و پیرۆزترین بێ باکی و دەوڵەمەندی یە، تەوفیق و دەست پیاراگەیاندن باشترین هاریکاری و یارمەتیدەرە، یادکردنەوەی مردن باشترین ئامۆژگاری کارە.

### ۱۰۷) هۆکارەکانی و مەبەستەکانی:

تێگەیشتن دەفری زانستە، زانست چاوساغی کارکردنە، کارکردن پێشەوا و پێشەنگی چاکەیە، ئارەزووبازی کەشتی یاخی بوونە، ماڵ و دارایی دەردی خۆبەزلزانەکانە، دونیا بازاڕی دوارۆژە، هاوار هەموو هاوار بۆ ئەو کەسەی بەبەهرەکانی خودا بەهێز دەبێت و تواناپەیدا دەکات، پاشان بەو هێز و توانایەی کار لەسەر بێ فەرمانی خودا دەکات و لێی یاخی دەبێت.

### ۱۰۸) پەشیمان بوونەوەی تەمێ کار:

پرسیار لەحەسەن کرا دەربارەی پەشیمان بوونەوەی تەمێ کار ((التوبة النصوح))، ئەویش وتی:

پەشیمانییە بەدڵ و، داواکردنی لێخۆشبوونە بەزمان و، وازهێنانە لەخراپەکان بەئەندامەکان و، بڕیاردانە بۆ نەگەڕانەوە بۆ ئەو خراپە و تاوانانە.

### ١٠٩) پێگەی نوێژ:

هەر نوێژێك لەكاتی ئەنجامدانیدا دڵت ئامادەی نەبوو، دڵنیابە ئەوە لەسزاوە نزیكترە تا پاداشت!

### ١١٠) یەدەكی مەرد:

یەدەكی كەسی مەرد كاركردن و پەلەكردنە بەرێك و پێكی بۆ ئەنجامدانی هەر كارێك، بەڵام یەدەكی كەسی نامەرد چەواشەكردن و هەڵخەڵەتاندن و بەدواخستن و درێژە پێدانی هەر كارێكە كە بیەوێت بیكات.

### ١١١) گەر مرۆڤ مەرگی خۆ بزانیایەت:

لەسەر بەردێك بینرا نوسرابوو: ئەی نەوەی ئادەم گەر بەڕاستی تۆ بتزانیایە و لێت دیاربوایە كە كەمێكت ماوە بۆ مەرگت، بێگومان دەستت دەگرتەوە لەوەی ئومێدەواری بوویت لە هیواكانت و، وازت دەهێنا لە زیادەكاركردنت بۆ دونیاو، دەستت كۆتا دەكرد لە سوربوون و ئارەزووەكانت، دەی باش بزانە لەگەڵ ئەوەشدا كە كاتی مەرگت نازانیت دڵنیابە سبەینێ پەشیمانیت یەخەت دەگرێت، قاچەكانت لەژێر پێست دەردەچن، خاو و خێزان وابەستانت پشتت تێ دەكەن و، نزیكەكانت یەخەت لێ هەڵدەتەكێنن و، خۆشەویست پشتت تێدەكات و، وات لێ دێت بانگ دەكرێیت وەڵام نادەیتەوە.

### ١١٢) باسکردنی چاکەکان و خراپەکاران:

ئەی نەوەی ئادەم: پێت خۆشە و دڵخۆش دەبیت کە چاکەکانت باسبکرێت، هەروەها پێت ناخۆشە کە خراپەکانت باسبکرێت، کەچی لەولاوە کەسانی دیکەی جگە لەخۆت بەگومان دەگریت و باسیان دەکەیت!، لەکاتێکدا تۆ دڵنیایت لەوەی کەبەڕاستی دوو فریشتە هاودەمتن و وتە و کردارت تۆماردەکەن و دەی پارێزن.

### ١١٣) خۆشەویستی دونیا گەورەیە:

هیچ شتێك بەئەندازەی کەسێك سەرم سوڕنامێنێ کە خۆشەویستی دونیا لەگوناهو گەورەکان حساب ناکات، دەی سوێند بەخودا خۆشەویستی دونیا لەگوناهە هەرە گەورەکانە، ئایا هەر لەبەر خاتری دونیا گوناهە گەورەکانت ئەنجام نەداوەو، هەر لەبەر ئەو بتت نەپەرستووە، وە هەر لەبەر خۆشەویستی و کاریگەریەکانی دونیا نییە یاخی بوون لەخودای باڵادەستو بێ فەرمانی کردنی؟.

### ١١٤) ئامۆژگاریکار(واعظا بێ بەری نییە:

ئەی خەڵکینە: بەڕاستی من کە ئامۆژگاری ئێوە دەکەم وە نەبێ لەئێوە باشتر و چاکترم، دڵنیابن دەرووني خۆم زۆر زیادەڕەوی هەیە، تائێستا بۆم دانەنراوە و، نەمتوانیوە وەك پێویست ژێرباری بخەم لەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگاری، خۆ ئەگەر بڕوادار ئامۆژگاری برا و خوشکی

بڕواداری نەکات تابەتەواوەتی ناخی خۆی دامەزراو و ژێر بارنەخات، ئەوە ئامۆژگاری کار نابن و، یادخەرەوانیش کەم دەبن..

هەروەها کەسێك نابێت خەڵکی بانگ بکات بۆلای خودا و هانیان بدات بۆ گوێڕایەڵی کردنی و، نەرێیان بکات لەیاخی بوون لێی و بێ فەرمانی کردنی، بەڵام لەڕاستیدا لەکۆبوونەوەی بەرچاوڕوونانن و، ئامادەبوون لەکۆڕی یادکردنەوە و، ئامۆژگاری کردنی بڕواداران لەلایەنی یەکتریەوە، دڵی بڕواداران بەتایبەتی پارێزگاران دەبوژێتەوە و، لەبێ ئاگایی بەئاگادێنەوەو، دڵنیا و سەلامەت دەبن لەبیرچوونەوە..

کەوایە خودا تەندروست و سەلامەتتان بکات بەردەوام ئامادەی کۆڕی یادکردنەوە بن و وابەست بن پێوەی، چونکە وادەبێت یەك وشەی کەم بایەخ سوودێکی زۆر دەگەیەنێت، شەرم لەخودا بکەن و تەقوای تەواوبکەن، وە هەوڵ بدەن بەموسڵمانیەتی نەبێت نەمرن.

### ١١٥) تاگۆڕانکاری لەخۆیاندا نەکەن:

((سەلەمەی کوڕی عامر)) وتی:

ڕۆژێکی هەینی لە خزمەتی حەسەندا نوێژی هەینیمان کرد، کاتێك تەواوبووین لەدەوری کۆبووینەوەو، حەسەن گریانێکی زۆر بەتین گریا، ئێمەش پێمان وت:

چیته خوا بەزەیی بێتەوە پیاتا، ئایا تۆ لەخەونا مژدەی بەهەشتت پێ نەدراوە؟

کە گوێبیستی ئەوەبوو زیاتر گریا و وتی: چۆن نەگریم؟ خۆ ئەگەر هەر ئێستا یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەدەرگای ئەم مزگەوتەوە بێتە لای ئێمە، جگە لەڕووگەکەمان کە ڕوومان تێکردووە، هیچی تر نازانێ و بەدی ناکات!

ئەمجا وتی: هەی هاوار، هەی هاوار، ئومێد و ئاواتەکان خەڵکیان فەوتاند و بەهەدەردا: وتەی بێ کردار، شارەزایی بێ خۆگری، باوەڕ بەبێ یەقین و دڵنیایی، هاوار بەماڵم پیاوان دەبینم کەچی ژیرمەندان نابینم، چرپە دەبیستم و هاودەم نابینم، کەسانێك هاتنەژوورەوە، پاشان بێ دەست مایە چوونەدەرەوە، قەدەغەکراوەکانیان وازلێهێنا پاشان ڕەواییان پێدانەوە بۆخۆیان، لەڕاستیدا دینی هەر یەکێکتان تەنها ئەوەیە کە لەسەر زمانیەتی، ئەگەر پرسیارکرا: ئایا تۆ بڕواداری بەڕۆژی لێ پرسینەوە؟ جا وتی بەڵێ: درۆی کردووە، کامەیە بڕوات بەڕۆژی لێ پرسینەوەت؟!

لەڕەوشتەکانی بڕوادار:

بەهێزیە لەدین دا، پێداگریە لەنەرم و نیانیدا، باوەڕە لە ناخدا، زانستە لە خۆڕاگریدا، خۆڕاگری و دان بەخۆداگرتنە بەپێی زانست و زانیاری، داناییە لەبەزەیی هاتنەوەو دڵ نەرمیدا، جوانی نواندن لە

نەبوونیدا، دەست پێوەگرتن لە دەوڵەمەنیدا، بەزەیی هاتنەوەیە لە خەرجکردندا، داواکردنی ڕەحمەت بۆ بەرهەمکار و کۆششکارە، بەخشینە لەجێبەجێ کردنی مافەکاندا، ناوەندکاری ((إنصاف)) لە ڕاوەستاوی‌و بەردەوامیدا، هەڵنەچوون بەسەرکەسێکدا کە دەی بوغزێنێت و ڕقی لێ یەتی، گوناهوتاوان ناکات لە هاریکاری کەسێکدا کە خۆشی دەوێت، هەرگیز پێ هەڵگرنییە و ناڕوات بەدوای دوو زمانیدا، شوێن ئەوە ناکەوێت کەهی ئەو نییە و پەیوەندی بەوەوە نییە، ئەو مافەی بەسەریەوەیە نکوڵی لێ ناکات، لەبیانوو هێنانەوەدا سنور ناشکێنێت، بەتاقیکردنەوەو ناڕەحەتیەکان نائومێد نابێت، هەرگیز بەتاوان و گوناهکردن دڵخۆش نابێت، گەر کەسێکی دیکەش جگە لەخۆی بیکات.

هەروەها وتی: ئاوەها بوون هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ، وە هەروابوون موسڵمانان لە پێشینە چاکەکانتان، وائێستا بەهۆی گۆڕانکاری خۆتانەوە، گۆڕان تیاتاندا هاتە ئەنجام.. ئەمجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾﴾ الرعد.

# هەندێک لە ئامۆژگاریەکانی پێشەوا حەسەنی بەسری بۆ دۆستانی قورئان[18]

---

[18] لەپەڕاوی: ((وصايا الإمام الحسن البصري لأهل القرآن))، کۆکردنەوەی: ((أبو عبدالله حَمزة النَّايلى)) ـ دار الام البغوى ـ الدوحه ـ قطر وەرمگرتووه.

خوێنەری ئازیز پێش ئەوەی بێمە سەر وەرگێڕانی هەندێ لە ئامۆژگاریەکانی حەسەنی بەسری - خوا لێی ڕازی بێت - بۆ دۆستانی قورئان، بەلامەوە زۆر گرنگ بوو هەندێك لە پێشەکیەکەی ((أبو عبدالله حمزة النایلی)) وەربگێڕم، چونکە کۆمەڵێك سەرنجی زۆر گرنگ و بەپێزی دەربارەی قورئانی پیرۆز لەخۆگرتووە:

بەناوی خودای ڕۆزیدەری میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگار، درود و ڕەحمەت بۆ گیانی سەروەری پێغەمبەران موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا و یارو یاوەران و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی ڕەستاخێز.

بێگومان قورئانی پیرۆز وتەی پەروەردگاری جیهانیانە، ئەوەیە فریشتەی دەستپاك ((جبریل)) دایبەزاندوەتە سەر کۆتایی پێغەمبەران و، گەورەی ڕەوانەکراوان، بەزمانی عەرەبی ڕەوان، تابەهۆیەوە پەروەردگار جیهانی جنۆکە و مرۆڤ ئاگاداربکاتەوە.

خودای هەرە بەبەزەیی دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿٩٥﴾﴾ الشعراء. واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە، جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە

بۆسەر دڵی تۆ بۆئەوەی لەترسێنەران و ئاگادارکاران بیت، بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و پاراو.

شێخ سەعدی ـ ڕەحمەتی خودای لێبێت ـ دەڵێت: ئەوەی ناردویەتیە خوارەوە، بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکانە، پەروەردەکاری سەرجەم جیهانی بڵند و نەویە، جا هەروەك پەروەردەی کردوون بەڕێنمایی کردنیان بۆ بەرژەوەندی دونیایان و لەش و لاریان، بێگومان پەروەردەی کردوون بۆ بەرژەوەندیەکانی دینیان و دوارۆژیان.

وە لەگەورەترینی ئەوەی بەهۆیەوە پەروەردەی کردوون: دابەزاندنی ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە، کە چاکە و خێرێکی زۆر و فراوانی لەخۆگرتووەو، ڕێنمایی تێدایە بۆ هەردوو دونیا، لەگەڵ ڕەوشتە بەرز و شکۆدارەکاندا کە جگە لەو لە هیچ پەڕاوێکی تردا نییە، وە لەفەرموودەیدا ـ جلّ جلاله ـ ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ لە گەورەیی و زۆر گرنگی دان تیایدا، لەبەرئەوەیە تەنها لەلایەن خودای باڵادەستەوە هاتۆتە خوارەوە، مەبەستیش تێیدا سوود و ڕێنمایی ئێوەیە.

﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ﴾: ئەوە جبریلە ـ علیه السلام ـ، ئەوەی کە گەورەترین و بەڕێزترین و بەهێزترینی فریشتەکانە، ﴿ٱلۡأَمِينُ﴾ ئەوەیە کە دەستپاکە کە تیایدا زیاد بکات یان کەم بکات.

﴿عَلَىٰ قَلۡبِكَ﴾ ئەی موحەممەد، ﴿قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ﴾ تابەهۆی ئەو قورئانەوە ڕێنمایی بکەیت بۆ ڕێگای دروست و چاك و، ترسێنەر بیت لە گرتنەبەری ڕێگای نادروست و خراپە و یاخی بوون.

﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ﴾ بەشکۆدارترین زمانێك، کە زمانی عەرەبی یە، ڕوون و ڕەوانە، بەزمانی موحەممەد ﷺ کەڕەوانە کرا بۆ سەریان تا بانگهێشتیان بکات بۆ سەر ئاینی خودا کە ئیسلامە.

جا سەرنج بدە: چۆن ئەم هەموو ڕێز و گەورەییە ناوازە لەم پەڕاوە پیرۆزەدا ((قورئان)) کۆبووەتەوە، لەڕاستیدا قورئان ڕێزدارترین و گەورەترینی پەڕاوەکانە، ڕێزدارترین فریشتە هێناویەتە خوارەوە، بۆ سەر ڕێزدارترینی دروستکراوەکان، بۆ سەر ڕێزدارترینی پارچەی لەشی، کە دڵی یەتی، بۆ سەر بەڕێزترینی ئوممەتێك لەنێو خەڵکیدا بە بەڕێزترین زمان کە زمانی عەرەبی ڕوون و ڕەوانە.

گوزارشتەکانی حەقق و بێگومانن، داستانەکانی ڕاستن، خودای بالادەست فەرموویەتی: ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ﴾ الإسراء:١٠٥.

پێشەوا ئیبنو جەوزی - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ﴾ پیتی ((هاء)) مەبەست پێی قورئانی پیرۆزە، ماناکەشی: ئێمە قورئانمان بە فەرمانێکی جێگیرو دینێکی ڕاستو ڕەوان دابەزاندو

ڕەوانەکرد، بەڕاستی ئەو قورئانە حەققە، دابەزینی حەققەو، ئەوەشی لەخۆی گرتووە حەقق و ڕەوایە.

خودای دانای زانا بەهۆیەوە ڕەحم دەکات بەوەی لە مرۆڤەکاندا باوەڕی پێیەتیو کاردەکات بەو بڕیارانەی تیایەتی، بەهۆی ئەو باوەڕ پێ بوون و کارکردنەوە پێی ڕێنماییان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست و ڕزگاری و، بەدووریان دەگرێت لە تیاچوون و هەڵخلیسکان و مل شکان، خودای باڵادەست دەفەرمووێت:

﴿وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾ النمل.

شەوکانی - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: ((واتە: بەڵێ بەڕاستی قورئان ڕێنمایی و ڕەحمەتە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی بەزاتی ئەڵڵا هەیەو شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەیەتی، بڕوادارانی تایبەت کردووە بەوەوە، چونکە بەڕاستی ئەوانن پێی سودمەندن.

طاهیری کوڕی عاشور - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: بەوە کە قورئان ڕێنماییە بۆ بڕواداران ئەوە بەڕاستی ڕوون و ئاشکرایە، بەوەی کە ڕەحمەتە بۆیان، ئەوەش لەبەرئەوەیە کاتێك کە ئەوان بەڕاستی شوێن ڕێماییەکەی کەوتن، ئەوە بێگومان سەرکەوتن و بەختەوەری لە دونیادا بەدەست دەخەن، ئەوەش بەچاککردنی ناخی خۆیان و ڕێك و پێك کردن و ڕێکخستنی کارەکانیان و یەکخستنی وتەکانیان و ڕیزەکانیان، لەدوا

ڕۆژشیدا، بەهەشت مسۆگەر دەکەن، پەیامی موحەممەدی هەر چەند لە ڕاستیدا ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهانیان، هەروەك لەفەرموودەی خودای بالادەستدا هاتووە:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء.

خودا قورئانی کردۆتە جیاکەرەوە ((فُرقان)) لەنێوان، ڕەوا و ناڕەوادا[19]، خودای شکۆمەند و بەتوانا دەستەبەربووە بەپاراستنی لە هەموو زیاد و کەم کردنێکی، یان گۆڕین و گۆڕینەوەی، دەفەرمووێت:

﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ الحجر.

شێخ سەعدی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ﴾: واتە: ئەو قورئانەی باسی هەموو شتێکی تێدایە لە باس و خواستەکان و بەڵگە ڕوون و ئاشکراکان، یاد خستنەوەی تێدایە بۆ ئەو کەسەی یادخستنەوەی دەوێت، ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ واتە: لەکاتی دابەزاندنی فریشتەکان پاراستوویانە لە دزەکردنی هەموو شەیتانێکی نەفرین لێکراو، لەپاش دابەزاندنیشی خودای بالادەست خستویەتیە نێو دڵی پێغەمبەرەکەی و، کردویەتیە ئەمیندار بەسەریەوە، پاشانیش بەهەمان شێوە سپاردوویەتی بە ئوممەتەکەی، خودا وشەو پیتەکانی

---

19

پاراستووه له کەم و زیادی و گۆڕان، هەروەها ماناکانیشی پاراستووه لەگۆڕینەوە..

هەر گۆڕان کار و شێوانکارێك ویستبێتی مانا و واتایەکی بگۆڕێت و بیشێوێنێ ئەوە خودای باڵادەست کەسێکی بۆئامادە و سازکردووە، ڕاستیە ڕوون و ئاشکراکە ڕوون بکاتەوە، ئەمەش لەگەورەترینی نیشانەکانی زاتی ئەڵڵا و بەهرەکانیەتی بەسەر بەندە بڕوادارەکانیەوە، لە شێوەی پاراستنی ئەوەیە کە خودا دۆستانی دەپارێزێت لە دوژمنان و، دوژمنێك ناسەپێنێت بەسەریاندا ڕایان بماڵێت و خۆی بەسەریاندا ڕابدات.

هەروەها لەشێوە و نموونەی پاراستنی بۆ پەڕاوە شکۆمەندەکەی، ئەوەیە کە لەبەرکردنی ئاسان کردووە بۆ موسڵمانان، خودا دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ١٧﴾ القمر.

واتە: بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆیادخستنەوە و ئامۆژگاری لێ وەرگرتن جا ئایا کەسێك هەیە پەندی لێ وەربگرێت.

شەوکانی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾ یانی: ئاسانمانکردووە بۆ لەبەرکردن، هەروەها هاریکاری ئەو کەسەمان کردووە لەسەری کە ویستوویەتی لەبەری بکات، وتراویشە:

ئامادەمان کردووە بۆ بیرخستنەوە و ئامۆژگاری و پەند لێ وەرگرتن، ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾، یانی: بەئامۆژگاریەکانی ئامۆژگاری کارە و، بەپەندەکانی پەند بەخشە.

هەروەها لە ئایەتەکەدا هاندان هەیە لەسەر وتنەوەی قورئان و، زۆر خوێندنەوەی و پەلەکردن لە فێربووندا.

ئەی خۆشەویستان: بەڕاستی ئەو موسڵمانەی کە حەز لە خواپەرستی دەکات و سوورە لەسەر بڵاوە پێکردنی چاکەکان‌و ڕاگەیاندنیان، ئەوە زۆر زۆر دڵخۆش دەبێت کاتێك سووربوونی موسڵمانان دەبینێت لەسەر خەرجکردن و گرتنەبەری ئەو هۆکارانەی کە هاریکاریان دەکات لەسەر لەبەرکردنی پەڕاوی ((قورئانی)) شکۆمەندی پەروەردگار.

جا لەوانە: سووربوون لەسەر دروستکردن و هاریکاری کردنی ئەو مەڵبەندانەی گرنگی دەدەن بە فێرکردنی قورئان و لەبەرکردنی.

بەختەوەری هەموو بڕوادارێك دادەگرێت، کاتێك سووربوون و بەدەمەوەچوونی ڕۆڵەکانی ئیسلام لەنێر و مێ و گەورە و بچووك دەبینێت لەسەرجەم شار و گوندی وڵاتدا لەسەر لەبەرکردن و فێربوونی قورئانی پیرۆز، هەر کەسە بەپێی دەسەڵات و توانای.

ئەوەی پێویستە لێرەدا: یەکەم کەس یادی خۆمی دەخەمەوە و بەخۆم دەڵێم، پاشان بە هەرکەس کە خودای بەتوانا کاری بۆ ئاسان

کردووه بە دەستپێکردنی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، هەر کەس کە خودا تەوفیقی داوە بۆ تەواو لەبەرکردنی قورئان و، وانەبێژانی قورئان و، پێ لەبەرکاران، شتێکی گرنگ هەیە کە ئەوە بەردی بناغەی دین و، ڕێگای سەرفرازی و سەرکەوتنە لە هەردوو دونیادا، هەر بەوەش پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات، ئەوەش ئەو دڵسۆزیەیە کە کردوومانە بۆ خودای ڕۆزیدەری میهرەبان لەکارەکانماندا، خودای بەتوانا دەفەرمووێت:

﴿وَمَا أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ البيّنة: ٥.

واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانیان پێ نەدرابوو مەگەر بەوەی کە بەتەنها پەرستشی خودابکەن بەدڵسۆزی ملکەچی بۆ بکەن و خۆیان بەدووربگرن لە هەموو بیرو باوەڕێکی خوار و خێچ.

پێشەوا ئیبنو قەییم ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((هەرکەس دڵسۆز نەبێت لە خواپەرستی یەکەیدا بۆ زاتی ئەڵڵا ئەوە کاری نەکردووە بەوەی کە فەرمانی پێکراوە، بەڵکو ئەوەی ئەنجامی داوە شتێکی فەرمان پێ نەکراوبووە، لەبەرئەوە بەڕاستی نە دروست بووە و، نە لێشی وەردەگیرێت)).

جا هەر پێویستە لەسەرمان: کە زۆر سوپاسی خودای شکۆمەندی بەخشندەی بەتوانا بکەین لەسەر ئەم بەهرە گەورە ((قورئان)) بەدڵ و ئەندامەکان و زمان.

پێشەوا ئیبنو قەیم - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: ((حەقیقەت و ڕاستی سوپاس و ستایش لەخواپەرستیدا، دەرکەوتنی کاریگەری و شوێنەواری بەهرەی خودایە لەسەر زمانی بەندەکەی وەك سوپاسکردن و پێ زانین، وە لەسەر دڵی وەك خۆشەویستیو لەبەرچاو بوونی، لەسەر ئەندامانیشی وەك ملکەچی و گوێڕایەڵی.

سوپاس و ستایش کردن لەسەر پێنج بنەمایە:

١) ملکەچی سوپاسگوزار بۆ سوپاسکراو.

٢) خۆشەویستی بۆی.

٣) دانںان و پێ زانین بەبەهرەکانیدا.

٤) سوپاس و ستایشکردن لەسەری.

٥) بەکاری نەهێنێت بەشێوەیەك خوا پێی ناخۆش بێت.

لەڕاستیدا ئەم پێنجە: بنەماکانی سوپاسگوزاریە، هەر لەسەر ئەوانەش سوپاسگوزاری دامەزراوە، جا هەر کاتێك یەکێکیان نەبوو، ئەوە بنەمایەك لە بنەماکانی سوپاسگوزاری تێکدەچێت، هەر کەس تەنها

به وته له سوپاسگوزاری بدوێت، ئەوه لەڕاستیدا وتەکەی دەگەڕێتەوه سەری، هەر بەدەوریدا خول دەخوات))٠

پێویسته بیری خۆمانی بهێنینەوه: که مەبەست له لەبەرکردنی قورئان و فێربوونی کارکردنه بەوەی تیایدا هاتووه، نەك تەنها گرنگیدان به وشەکانی و گوێنەدان به ماناکانی، پێشەوا ئیبنو قەییم دەڵێت: دۆستانی قورئان: زانایانن پێی و کارکەرن بەوەی تیایەتی، ئەگەرچی لەبەریشیان نەبێت، لەڕاستیدا ئەو کەسەی لەبەری کردووه و تێی نەگەشتووه و کاری بەناوەڕۆکەکەی نەکردووه، ئەوه لەدۆستانی قورئان نییه ئەگەرچی وشه و پیتەکانیشی وەك لێدانی تیر بپێکێت، چونکه بەڕاستی دۆستانی پەروەردگار ئەوانەن کۆکاریان کردووه له نێوان لەبەرکردن و کارکردن بەوەی که هاتووه له قورئاندا، له ئەنەسی کوڕی مالیکەوه ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ فەرموویەتی: ((إِنَّ لله أهلِين مِن النَّاس))، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا: ئەوانه کێن؟

ئەویش فەرمووی: ((هُمْ أَهْلُ القرآن، أَهْلُ اللهِ و خاصَّتُهُ)) واته: ئەوانه دۆستانی قورئانن، دۆستان و تایبەتانی ئەون.

مەنناوی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((أَهْلُ اللهِ و خاصَّتُهُ)): یانی: لەبەرکەرانی قورئان و کارکەران بەناوەڕۆکی ئەوانه دۆستانی تایبەتی زاتی ئەڵلان، ئابەوه ناوبراون وەك بەگەوره ڕاگرتنیان، هەروەك دەوترێت: ماڵی خودا.

پێشەوا ئیبنو ئەسیر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: لەبەر بووانی قورئان و کارکەران پێی، ئەوانە دۆستانی تایبەتی زاتی ئەڵڵان.

لەبەرئەوە پێویستە لەسەر هەڵگری قورئان کە بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوەی کە لەسنگیدا هەڵی دەگرێت، هەروەها ئەو کاریگەریە دەربکەوێت لەسەر ئەندامەکانی و، باڵادەست بێت لەسووربوونی لەسەر چاکەکردنی بۆ کەسانی دیکە جگە لەخۆی.

پێشەوا حەسەنی بەسری ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ئەو کەسەی لە زانست و زانیاریدا باڵادەستە، لەنێو خەڵکیدا شایانی ئەوەیە لە کرداریشدا باڵادەست بێت بەسەریاندا.

لەڕاستیدا لەم پەڕاوەدا بەلوتفی خودای پەروەردگار هەندێك ئامۆژگاری ئیمانی و ڕێنمایی خودایم کۆکردۆتەوە بۆ دۆستانی قورئانی پیرۆز، لە وتەی یەکێك لە زانا بەرزەکان، ئەوەی خودای بەتوانا موسڵمانانی پێ سوودمەندکردووە، کە ئەویش حەسەنی بەسری یە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ.

ئەی خۆشەویستان ئەوەی بۆ ئەم کارە هانی دام کۆمەڵێك هۆکار بوو لەوانە:

١) ئامۆژگاری کردن لەنێوانماندا، بەتایبەتی کە ئێمە ئەمڕۆ لە ڕۆژگارێکداین کە خێر و چاکە تیایدا کەم بووە، شەڕ و خراپە تیایدا زۆر

بووە، ئەم بیرخستنەوەش پەیڕەوە لە فەرموودەی خودای بەتوانا: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾﴾ الذاريات. واتە: ئامۆژگاریان بکە و بیریان بخەرەوە چونکە بەڕاستی ئامۆژگاری سوود بەبڕواداران دەگەیەنێ.

٢) بڵاوبوونەوەی دەردێکی کوشندە و، پەرەسەندنی نەخۆشیەکی بێ ئەمان لە نێو هەندێ لەوانەی گرنگی دەدەن بە قورئانی پیرۆز، کە ئەوەش جیاکاری و نێوەندکاریە لەنێوان زانست و کاردا.

بەڕاستی ئەمە نەخۆشییەکی مەترسیدارە، پێشینانی ئێمەش لە چاکەکاران سکاڵایان لەدەست کردووە، دەی دەبێت ئەی خۆشەویستان، ئێمە چۆن سکاڵای لەدەست نەکەین و وریای نەبین لەم ڕۆژگارەماندا کە تیایدا ئاشوبە و گومان و ئارەزووبازیەکان زۆربوونو پەرەیان سەندوە.

٣) ئەو پلە و پایە بەرز و بڵندەی پێشەوا حەسەنی بەسری هەیەتی لەنێو موسڵمانانندا بەگشتی و، لای قوتابیانی زانست و زانیاری و دۆستانی قورئاندا بەتایبەتی.

پێشەوا زەهەبی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەبارەی حەسەنەوە دەڵێت: هەڵوێستە جوانەکانی زۆر و، چاکەکانی بەرفراوان و بێ شومار، لەزانست و فەرموودەدا زانا بوو، پێشەوایەکی کۆششکاری زۆر شارەزابوو، لە قورئان و لێکدانەوەدا ((التفسير)) زانا بوو، هەروەها لە ئامۆژگاری و

ئاگادارکردنەوە و، دان بەخۆداگری و خوداپەرستی و، دونیانەویستی و ڕاستگۆی و، ڕەوانبێژی و، دەستگوشادی و ئازایەتیدا سەربوو.

٤) مەبەستم پێی کۆکردنەوەکەی ئاسانکاری بوو بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێت سوودمەند بن لە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی حەسەن لەبارەی خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئانەوە و کارکردن پێی.

* * *

# وەسیەت و ئامۆژگاریەکانی

# پێشەوا حەسەن بۆ دۆستانی قورئان

### حیکمەت و مەبەست لەدابەزاندنی قورئان

پێشەوا حەسەن - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: ((قورئان دابەزێنراوە تا کاری پێ بکرێت[20]، کەچی خەڵکی تەنها خوێندنەوەیان بەکاردناوە)).

موبارەکی کوڕی فەزالەی عەدەویی - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: پێشەوا حەسەن دەربارەی فەرموودەی خودا: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾[21] البقرة: ١٢١.

---

[20] پێشەوا فوزەیلی کوڕی عەیاز - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: ((واتە: حەڵاڵەکانی کار پێ بکرێت و، حەرامەکانی وەلا بخرێت، هەروەها کار بە سەرجەم ئەری و نەرێکانی بکرێت. ((أخلاق حملة القرآن)) للآجري ((ص - ١٠)).

وتوویەتی: ((ئەوانەن کە کار بە حوکم و فەرمانەکانی دەکەن و، بڕوایان بە لێکچووەکانی هەیە و، ئەوەی لایان ڕوون نەبێت و کێشەبێت لایان دەیگێڕنەوە بۆلای زانا و شارەزایانی[22])).

## هاندان لەسەر وابەست بوون بە قورئانەوە

حەسەنی بەسری دەڵێت::

١) وابەست بن بەپەڕاوی خودای باڵادەستەوە، شوێن ئەو نموونانە بکەون کە تیایدایە[23]، وە لە خوێندنەوەیدا لە تێبینی کاران و سەرنجداران بن.

---

[21] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ وتوویەتی: ﴿يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ البقرة: ١٢١. یانی بەتەواوی شوێنی دەکەون و کار بەئەرێ و نەرێ و حەڵاڵ و حەرامی دەکەن و، سەرجەم فەرمانەکانی ئەنجامدەدەن. {رواه: الطبري في تفسيره، والفريابي في ((فضائل القرآن)).

[22] رواه: الفريابى في ((فضائل القرآن))، والطبري في تفسيره، و إبن حاتم في تفسيره، {٢١٨/١}.

[23] پێشەوا ئیبنو تەیمیە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ نموونەکان ئاوەها پێناسە دەکات: ((نواندنی شتێك بەشتێك لە حوکمەکەیدا، نزیك کردنەوەی شتێکی مەعقول لە هەست پێکراوێکەوە، یان هەست پێکراوێك لە دووان لەوی دیکەیان و، ئیعتیباری یەکێکیان بەوی دیکەیان. {إعلام الموقّعين ـ ١/١٥٠}.

٢) هیچ شتێك له دەستماندا نەماوە جگە لەم قورئانە، دەی بە پێشەوا وەری بگرن و کاری پێ بکەن، بیکەنە سپاردە و ئەمیندار بەسەرخۆتانەوە و، پەردەپۆشی ئارەزووەکانتانی پێ بکەن. دڵنیابن و بزانن قورئان تکاکارە و تکا لێ وەرگیراوەو، دەستگیرێکی متمانە پێکراوە. هەر کەس لەرۆژی ڕەستاخێزدا قورئان تکای بۆ بکات تکای بۆ وەردەگیرێت. وە هەرکەس قورئان دەستگیری بێت دەیگەیەنێتە بەهەشت.[٢٤]

وە سوێند بە خودا، لە خراپترینی ئەم ئوممەتە کەسانێکن قورئان دەخوێننەوە، بەڵام کارپێکردن پێی پشتگوێ دەخەن لەشوێنی خۆیداو وەك خۆی بەکاری ناهێنن و گۆڕانکاری تیادەکەن.

---

هەروەها دەڵێت: نموونەکان لە قورئاندا بۆ زۆر کاروبار سوودیان لێ وەردەگیرێت: بیرخستنەوە، ئامۆژگاری، هاندان، متمانە پێکردن، نزیك کردنەوەی ویستراو بۆ ژیری، وێنەکێشانی لەوێنەیەکی هەست پێکراودا، ڕوونکردنەوەی جیاوازی پاداشت، دەربارەی پیا هەڵدان و زەم کردن و، پاداشت و سزا و، جێبەجێ کردنی کارێك و بەتاڵ کردنەوەی و، گرنگی پێدانی کارێك یان بێ بایەخکردنی.{بدائع الفوائد، ٨١٥/٤}.

٢٤ پێشەوا حەسەن - - خوا لێی ڕازی بێت - وادیارە ئەوەی لە فەرموودەی جابر - خوا لێی ڕازی بێت - وەرگرتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((القرآنُ شافعٌ مُشَفَّعٌ، وَمَاحِلٌ مُصَدَّقٌ، مَنْ جَعَلَهُ إماماً قادَهُ إلى الجنة، وَمَنْ جَعَلَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ سَاقَهُ إلى النّار)).{رواه إبن حبان، وصححه الألباني ٢٠١٩}.

هەروەها خاوەن مافترین کەس بە قورئانی پیرۆز، ئەو کەسەیە کاری پێدەکات، ئەگەرچی دەوریشی نەکاتەوە و لەبەریشی نەکات[٢٥].

٣) حەسەن هەر لەوبارەوە وتوویەتی:

((قورئان، قورئان، بەڕاستی ئەو تکاکاری تکا لێوەرگیراوە دەستگیرێکی متمانە پێکراوە، سوێند بەخودا هیچ دەوڵەمەندیەك بەبێ قورئان نییە، وە لەدوای قورئان هیچ هەژاریەك نییە))[٢٦].

## کەسانی شایستە بە قورئان

پێشەوا حەسەن لەوبارەوە دەفەرمووێت:

١) کەسانێك هەن لەخەڵکی قورئانیان لەبەرکردووە و بەردەوام دەیخوێننەوە، کەچی کارپێکردنی نازانن، دەی بەڕاستی شایستەترین کەس بەم قورئانە کەسێکە بەکردار شوێنی کەوتووە، ئەگەرچی لەبەریشی نەکردووە و بەردەوامیش نایخوێنێتەوە.

٢) دەڵێت: ((بەڕاستی لە خراپترینی خەڵکی کەسانێکن قورئانیان لەبەرکردووە و بەردەوام دەیخوێننەوە، کەچی کار بەداواکانی ناکەن و

---

٢٥ وتەیەکی پێشەوا ئیبنو قەییم - خوا لێی ڕازی بێت - لەو بارەوە هاتووە کە لەپێشەکی یەکەی ((ئەبو عەبدیلا..

٢٦ ((واللە مادُونَ القرآن من غنيٍّ، وَما بَعْدَ القرآن مِنْ فَقْرٍ)) پێشەوا غەزالی لەپەڕاوی ((إحياء علوم الدين))دا باسی کردووە.

شوێن ڕێگاکەی ناکەون: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّـٰعِنُونَ﴾ البقرة: ١٥٩. واتە: ئەوانە خودا نەفرەتیان لیٚ دەکات و نەفرەتکەرانیش نەفرەتیان لێدەکەن.

## قورئان شیفایە[٢٧]

پێشەوا حەسەن لەم بارەوە دەڵێت: ((ئەی خەڵکینە ئەم قورئانە شیفا و چارەسەرە بۆ بڕواداران، پێشەواو چاوساغی خۆپارێزانە، هەرکەس بەڕاستی پەیڕەوی ڕێنماییەکانی بکات ئەوە ڕێگای ڕاست

---

[٢٧] شەیخ سەعدی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((قُلْ هو لِلَّذينَ آمَنُوا هُدىً و شِفاءٌ)): یانی: ڕێنماییان دەکات بۆ ڕێگای سەرفرازی و ڕێگای ڕاست، هەروەها لەزانستە سوود بەخشەکانیان فێردەکات ئەوەندەی بەهۆیەوە ڕێگای هیدایەتی تەواو بەدەست بخەن، وە شیفاو چارەسەر بۆیان لە هەموو نەخۆشی یەکانی جەستە و دڵ و دەروونیان، لەبەرئەوەی بەڕاستی نەرێیان لیٚ دەکات لە ڕەوشت و کردارە خراپو ناشیرینەکان، وە هانیان دەدات لەسەر گەڕانەوەو پەشیمانی تەواو و ئامۆژگاری کار ئەوەی گوناهەکان دەشواتەوە و دڵ و دەروونیش شیفا دەدات، ئەمەش بە مەرجێك ئەو کەسە لە ئەهلی خوداپەرستی و گوێڕایەڵی و باوەڕێکی دامەزراوبێت، بەهۆیەوە شایستەی تەوفیق و هاریکاری خودای بەخشندە و بەتوانابێت)).

دەگرێتەبەر، وە هەرکەسیش لێی لابدات ئەوە بەدبەخت و چارە ڕەش دەبێت و تووشیی بەڵادەبێت)).

## خۆ نواندن و پیشاندانی بەندە لەسەر قورئان[28]

پێشەوا حەسەنی بەصری ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەو بارەوە دەڵێت:

١) ((هەرکەس پێی خۆشە کە بزانێت ئەو چییەو چۆنە، باخۆی بەرامبەر بکات لەگەڵ قورئاندا)).

٢) ((ڕەحمەتی خودا لەو کەسە بێت ناخی خۆی و کردارەکانی بەراورد دەکات لەگەڵ قورئان، جا ئەگەر وەك ئەوە وابوو کە قورئان داوای لێ دەکات و فەرمانی پێدەکات ئەوە سوپاسی خودا دەکات و داوای زیاتری لێدەکات، خۆ ئەگەر پێچەوانەی بوو ئەوە لۆمەی ناخی خۆی دەکات و، زووبەزوو دەگەڕێتەوە و پەشیمان دەبێتەوە)).

---

[28] پێشەوا ((ئاجەری)) ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((بڕواداری ژیر کە قورئانی خوێندەوە خۆی بەرامبەر دەکات لەگەڵیدا، ئەوجا هەروەك ئاوێنە ئەوەی کرداری جوان و چاکیەتی بەهۆیە دەیبینێت، هەروەها ئەوەی ناشیرین و قیزەونیش بێت، ئەوەی کە خودا ئاگاداری کردبێتەوە لێی، خۆی لێ لادەدات، ئەوەی خودا لە سزاکەی ترسانبێتی لێی دەترسێت، وە ئەوەی خودا هانی دابێت بۆی، هەوڵدەدات ئەنجامی بدات و ئومێدی بەسەرئەنجامی باشی هەیە. {أخلاق حملة القرآن} للآجری ـ ص٢٨.

٣) ((بێگومان موسڵمانان گەواهیدەری خودای باڵادەستن لەسەر ڕووی زەویدا، کردارەکانی نەوەکانی ئادەم لەگەڵ قورئاندا بەرامبەر دەکەن، جائەوەی لەگەڵ پەڕاوی خودای پەروەردگاردا هاتەوە، ئەوە سوپاسی خودای لەسەر دەکەن، وە ئەوەشی پێچەوانەو دژی پەڕاوی خودابوو، بەو پەڕاوە دەزانن کێ لە بەندەکانی خودا تووشی گومڕایی بووە و، جۆری گومڕاییەکەشی دەست نیشان دەکەن، لەخراپترینی خەڵکی کەسانێکن ئەم قورئانە دەخوێننەوەو پەیڕەوی ناکەنو داواکانی نازانن، خاوەنترینی ماف بەم قورئانە کەسێکە بەکردار شوێنی دەکەوێت، ئەگەرچی لەبەریشی ناکات و کەمیش دەی خوێنێتەوە.[٢٩])).

---

[٢٩] ((فضائل القرآن)) للفريابي - ص١٦٣، وكذلك في ((حلية الأولياء)) - ص١٥٨/٢)).

## تام و چێژی خوداپەرستی لە خوێندنەوەی قورئاندا[٣٠]

پێشەوا حەسەنی بەسری دەڵێت: ((لەسێ شتدا بەدوای تام و چێژ و شیرینیدا بگەڕێن: لەنوێژ[٣١] و، قورئان و، یادکردنەوەدا ((الذکر[٣٢]))،

---

[٣٠] بەڕاستی ئەی خۆشەویستان چێژی گوێڕایەڵی و تامی خوداپەرستی هیچ بەندەیەك بەبێ هاریکاری خودای بەخشندە بەدەستی ناخات، پاشانیش سووربوونی لەسەر ئەنجامدانی ئەو هۆکارانەی کە یارمەتی دەدات لەسەر گەیشتنی بەو تام و چێژە، پێشەوا ((ئیبنو قەییم ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: لەڕاستیدا لە دڵدا شڵەژاویەك هەیە هیچ شتێك چاکی ناکاتەوە جگە لە پەنابردن نەبێت بەخودا، هەروەها گۆشەگیریەکی تێدایە بەهاودەمی کردنی خودانەبێت لە تەنیایدا ناڕوات، وە غەم و پەژارەیەکی تێدایە بەدڵخۆشبوون نەبێت بەناسینی خودا و ڕاست هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیدا ناڕوات و ناگۆڕێت بۆشادی، دڵەڕاوکێ یەکی تێدایە دانامرکێتەوە و دانامەزرێت بەهەڵهاتن نەبێت بۆ خزمەتی خودا و خۆپاڵدانە پاڵی ئەو، هەروەها گڕ و کڵپەی هەناسە هەڵکێشانێکی تێدایە مەگەر ڕازی بوون بە فەرمان و نەرێکان و بڕیارەکانی خودا و ئارامگرتن لەسەر ئەوانە تا ڕۆژی بەخزمەت گەشتنی بیکوژێنێتەوە، هەروەها داوایەکی توند و تیژی تێدایە، بەبێ گەڕانەوە تەنها بۆلای ئەو هیچ شتێك ڕای ناگرێت، وە ئاتاجی یەکی تێدایە هیچ شتێك نییە کۆتایی پێ بهێنێت جگە لە خۆشەویستی خودا و گەڕانەوە بۆلای ئەو و، بەردەوامی یادکردنەوەی و دڵسۆزی بۆی، ئەگەر دونیاشی بدرێتێ هەرگیز ئەو ئاتاجیە کۆتایی نایەت. {مدارج السالکین/ ٣/١٦٤}.

[٣١] بێگومان نوێژ لە گەورەترینی دروشمەکانی دینە و، پایەی بەتین و دامەزراویەتی، توێشووی بڕوادارانە و، ڕووناکی و خۆشنودی دیدەی گوێڕایەڵانە، لە ئەنەسەوە ـ

جائەگەر بەدیتان کردەوە، ئەوە بەردەوام بن‌و دڵشادو مژدەبەخش بن، خۆ ئەگەریش نەتان بینی، ئەوە باش بزانن کە دەرگاکانتان داخراون)).

## کاریگەری قورئان

پێشەوا حەسەن دەڵێت: ((سوێند بەخودا هەر بەندەیەك باوەڕی بەم قورئانە ببێت هەست بەدڵتەنگی و سیس بوون و، پەشێوی‌و شەکەتی دەکات)).

هەروەها دەڵێت: ((سوێند بەخودا ئەی نەوەی ئادەم، گەر قورئانت خوێندنەوە و، باش باوەڕت پێ کرد، ئەوە دڵنیابە غەمباریت لەو دونیادا درێژەدەکێشێت)).

---

خوا لێی ڕازی بێت - هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((جُعلتُ قُرَّةُ عيني في الصّلاة)) واتە: ڕووناکی و خۆشنوودی دیدەم لە نوێژدایە. {رواه: الامام أحمد في ((مسنده))/٣/٢٨٥، وصححه الألباني في ((صحيح الجامع، ٥٤٣٥)).

[٣٢] بەڕاستی بەیادکردنەوەی خودای پەروەردگار دڵەکان دەبوژێنەوە و، دەکرێنەوە و، دڵنیا و ئارام دەبن، خودای بالادەست دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ الرعد.

واتە: ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە، دڵیان ئارام دەبێت بەیادی خودا، ئاگاداربن کە هەر بەیادی خودا دڵەکان ئارام دەگرن و دڵنیادەبن.

وەدەڵێت: ((سوێند بەخودا، هەر کەسێك بووە هاودەمی قورئان و لەخزمەتیا دانیشت، کاتێك هەستا لەخزمەتیا بەزیادکردن[٣٣] و کەمکردن[٣٤] هەڵدەسێت)).

هەروەها دەڵێت: ((ئەگەر کەسێك تەنها بۆ خودا بەدوی قورئان و زانست بکەوێت، ئەوە زۆری پێ ناچێت لە ملکەچی و، دونیانەویستی و، خۆڕاگری و، خۆ بەکەم زانینیدا خۆی دەبینێتەوە)).

وەدەڵێت: ((سوێند بەخودا، هەر بەندەیەك ڕۆژ بکاتەوەو قورئان دەوربکاتەوە و بڕوای پێی هەبێت، بەو خوێندنەوەیە غەمباری بۆ قیامەت زیاد دەکات و، دڵخۆشی کەم دەبێت و، گریانی زیاد دەکات و، پێکەنینی کەم دەکات و، سەرنج و خەریکبوونی پێوەی زیاد دەکات و، دەست بەتاڵی کەم دەبێت)).

---

[٣٣] مەبەست لەو زیادکردنە پەرەپێدانی چاکەکانیەتی.

[٣٤] مەبەست لەو کەمکردنە دەست کۆتا کردنیەتی لە هەڵە و گوناهەکانی.

## ڕێگریەکانی کاریگەری قورئان لەسەر دل[35]

حەسەنی بەسری دەڵێت: ((ئەی نەوەی ئادەم چۆن دڵت گەشە دەکات، لەکاتێکدا کە ئاگایی و هیمەتی تۆ لەکۆتایی کۆتا سورەت و ئایەتدا بێت))[36].

---

[35] زۆرێك لە ئێمە گیرۆدەین بە دەردێکی مەترسی دارو شەڕێکی خراپەوە، کە ئەویش دڵ ڕەقییەو بێ ئاگایمانە لەکاتی یادکردنەوەی خودای پەروەردگاردا، وامان لێ هاتووە کاریگەری خوداپەرستیەکان لەسەر خۆمان بەدی ناکەین، بەڕاستی لەنوێژ تەواو دەبین هەرچۆن دەستمان پێ کردووە! هەروەها قورئانی پیرۆز دەخوێنینەوە کەچی ئاگامان لە واتاکەی نییەو لێی ورد نابینەوە. پێشەوا ئیبنو قەییم ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((هیچ بەندەیەك نییە سزا درابێت بەسزایەك گەورەتربووبێت لە ڕەقی دڵ و دووری لەزاتی ئەڵڵا)). هەروەها دەڵێت: ((بەڕاستی ڕەقیەك لەدڵدا هەیە، جگە لەیادکردنەوەی خودا هیچی تر نایتوێنێتەوە، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر بەندەکە بەیادکردنەوەی زاتی ئەڵڵا چارەسەری ڕەقی دڵی بکات)).
حەممادی کوڕی زەید لە موعەلای کوڕی زیادەوە دەڵێت: پیاوێك بەحەسەنی بەسری وت ئەی ئەبا سەعید، سکاڵای ڕەقی دڵم لەلای جەنابت دەکەم، چارم چی یە؟ ئەویش وتی: بەیادکردنەوەی خودا بیتوێنەرەوە.
لەبەرئەوە کەتا دڵ و زیاتر و زیاتر بێ ئاگابێت زیاتر ڕەقیەتی دای دەگرێت، جا ئەگەر خاوەنەکەی یادی خودای کردەوە، ئەوە ئەو ڕەقیە هەروەك چۆن ڕەساس لە ئاگردا دەتوێتەوە، ئاوەها بەو یادکردنەوەی خودا ئەو ڕەقی دڵە دەتوێتەوە. {الوابل الصیب ـ ص٩٩}.

## جۆری ئەو کەسانەی قورئان دەخوێننەوە

پێشەوا حەسەن دەڵێت: خوێنەرانی قورئانی پیرۆزە سێ جۆرن:

جۆرێکیان قورئان دەکەنە شمەکێك و، بەهۆیەوە دەخۆن و نانی پێ پەیدا دەکەن.

جۆری دووەمیان: وشە و پیتەکانی قورئانیان باش لەبەرکردووە، بەڵام سنورەکانی قورئانیان لەدەست داوە و پشتگوێیان خستووە، بەهۆیەوە خۆیان بەسەر خەڵکی وڵاتدا ڕادەدەن و، ڕووی فەرمانڕەوایان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن، ئەمجۆرە لەخوێنەران و لەبەرکارانی قورئان زۆرن، خودا زۆریان نەکات!.

جۆری سێ یەمیان: ئەوانەن قورئان وەك دەرمان وەردەگرن و، دەیخەنە سەر دەرد و ناساغی دڵەکانیان، بەهۆی قورئانەوە پێی دادەگرن لەهەڵوێستەکانیاندا بەرامبەر نەیارانیان، لەکاتی خەڵوەتیاندا بەهۆیەوە فرمێسکەکانیان دەڕێژن و هەست بەترس و بیم دەکەن و، پۆشاکی غەمباری دەپۆشن، بەڕاستی ئەوانە، ئەوانەن کە خودا

---

[٣٦] پێشەوا ئیبنو قەییم - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت: ((کە ویستت سودمەندببیت بە قورئان خوێندن، ئەوە لەکاتی خوێندنەوە و گوێ لێ گرتنیدا دڵت لەگەڵیدا کۆبکەوە، هەروەها گوێتی بۆ ڕابگرە و، خۆتی بۆ ئامادەبکە کەوا ئەوەی وا دەی دوێنێ بەوەی پێی دەدوێت زاتی ئەڵڵایە، چونکە لەڕاستیدا ئەو قورئانە وتارێکە لەوەوە بۆ تۆ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ)). الفوائد، ص٣.

بەهۆیانەوە باران و بەرەکەت دەبارێنێت، بەهۆیانەوە بڕوادارن بەسەر دوژمنانیاندا سەردەخات.[٣٧]

هەروەها دەڵێت: بێگومان لەڕاستیدا ئەم قورئانە کۆیلە و منداڵان دەیخوێننەوە، لەکاتێکدا کە هیچ زانیاریەکیان نییە دەربارەی لێکدانەوەو فەرمان و نەرێکانی)). هەروەك خودا دەفەرمووێت: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ[٣٨] لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ﴾[٣٩] ص: ٢٩. واتە: ئەم قورئانە

---

[٣٧] ((فضائل القرآن ـ ص ١٤٠)) رواه: أبو القاسم بن سلام. ((مختصر قيام الليل)) ـ ص٣٤ ـ ذكره: إبن نصر المروزي. ((شعب الايمان)) ـ ص٢٦٢٠ ـ رواه: البيهقي.

[٣٨] شێخ سەعدی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: هیچ شتێك نییە بەبەرەکەت تربێت لەم قورئانە، چونکە بەڕاستی هەرچی خێر و بەهرەی دینی و دونیایی، قیامەتی هەیە بەهۆی ئەوەوەیە و، بەرەنجامی کارکردنە بەو. {تفسير السعدي ـ ص٢٥}.

[٣٩] ئاجەری ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((ئایا نابینن ڕەحمەتی خواداتان لێ بێت، چۆن خودای پەروەردگارتان هانی بەندەکانی دەدات کە لەقورئانەکەی وردببنەوە و بیری لێ بکەنەوە؟ جا هەر کەس بەوردی بیربکاتەوە لە قورئان ئەوە باش پەروەردگارو دەسەڵات و توانای دەناسێت، لەگەڵ گەورەیی فەزڵی لەسەر بڕواداران، وە دەزانێت چ خوداپەرستی یەکی لەسەر بڕواداران، وە دەزانێت چ خودا پەرستی یەکی لەسەر پێویستە ئەوجا وابەست دەبێت بە ئەنجامدانیەوە، هەر بەو کارەی خۆی لادەدات لەوەی کە پەروەردگاری ئاگاداری کردۆتەوە لێی و، ئەوە ئەنجام دەدات کە ئەو فەرمانی پێکردووە، جا بێگومان هەر کەس لە قورئان بەبێ

کتێبێکی پیرۆزە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ ئەوەی بیربکەنەوە لە ئایەتەکانی، وە خاوەنانی بیر و ژیری پەندی لێ وەربگرن.

بەڕاستی بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی هیچی تر نییە جگە لە شوێنکەوتن‌و پەیڕەوی کردنی، دەی سوێند بەخودا، ئەوەش بەلەبەرکردنی نییە و وەلانانی سنورەکانی و گوێنەدان پێیان، تاوادەبێت بەڕاستی کەسێك لە قورئان خوێنان دەڵێت: بەڕاستی هەموو قورئانم خوێندۆتەوە و تەنها پیتێکم لەکیس نەداوە، بەڵام سوێند بەخودا ئەوە هەمووی لەکیس داوە و هەڵیدێراوە، چونکە نەکرداری و نەڕەوشتی لە قورئاندا نابینرێت، واش دەبێت بەڕاستی یەکێکیان دەڵێت: بەڕاستی من سورەتێك لەهەناسەیەکدا بەڕەوانی دەخوێنم! سوێند بەخودا، ئەوانە

---

خەرجی شیفایە بۆی و، بەبێ هۆز و پلە و پایەی دونیایی شکۆمەندیە بۆی و، هاودەمە بۆی کاتی تەنیای و گوشەگیری، هەروەها ئەو کەسە لەسەرەتای دەستکردنی بە خوێندنەوە، غەمی ئەوەیەتی چۆن پەند و ئامۆژگاری وەربگرێت لەوەی دەیخوێنێتەوە، وە ئاواتی ئەو ئەوە نییە کەی تەواوی دەکات، بەڵکو ویست و ئاواتی ئەو ئەوەیە کەی و چۆن وتەکانی خودا دەرك دەکات و تێی دەگات؟ وەکەی رادەچڵەکێت و، کەی و چۆن پەند وەردەگرێت؟ چونکە بەڕاستی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز خوداپەرستی یە، بێگومان خوداپەرستیش بەبێ ئاگایی نابێت، ئیتر خوداش هاریکار و پشتیوانە)) {أخلاق حملة القرآن ـ للآجري ـ ص٣}.

نەخوێنەران لەبەرکارانی قورئانن و، نەزانان و، نەدانان و، کەی خوێنەری ڕاستەقینەی قورئان ئەو جۆرە قسانە دەکات؟ خودا وێنەی ئەوانە لەناو خەڵکیدا زیاد نەکات.[40]

## زەمکردنی ئەو کەسەی بەقورئان دونیای دەوێ[41]

---

[40] رواه الامام عبدالله بن مبارك في الزهد، ص٢٧٤، ومن طريقه الفريابي في ((فضائل القرآن – ص١٦٠)) ورواه أيضاً الامام الآجريُّ في ((أخلاق حملة القرآن – ص٣٩)).

[41] پێشەوا ئاجری – خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێت: ((بەڕاستی هەرکەس قورئانی بۆ دونیا و دونیابیان خوێند، ئەوە بێگومان ڕەوشتی وایە کە قورئانی بەباشی لەبەرە، بەڵام سنورەکانی دەبەزێنێت و پشتگوێیان دەخات، لەناخی خۆیدا خۆی بەگەورە دەزانێت و، خۆی بەسەر خەڵکیدا ڕادەدات، قورئان وەك شمەکێك سەیردەکات، لای دەوڵەمەندان نانی پێوە دەخوات و ئاتاجیەکانی پێ چارەسەر دەکات، دونیاویستان بەگەورە سەیر دەکات و، هەژاران دەبوغزێنێت، کەمنداڵی دەوڵەمەند فێری قورئان دەکات زۆر بە نەرم و نیانی فێری دەکات لەبەرئەوەی چاوی لە دونیاکەیەتی، خۆ ئەگەر منداڵی هەژار فێربکات زەبر و زەنگی لەگەڵدا بەکاردەهێنێت لەبەرئەوەی بەتەمای دونیای نییە، بەهۆی قورئانەوە هەژاران بەکاردەهێنێت و بەگەڕیان دەخات بۆ خۆی، بەڵام بەهۆیەوە گەورەیی بۆ دەوڵەمەندان ڕەچاو دەکات، خۆ ئەگەر دەنگی خۆش بێت ئەوە بۆ پادشایان و فەرمانڕەوایان دەخوێنێت و پێش نوێژیان بۆ دەکات، لەبەرئەوەی چاوی لەدونیایە، بەڵام ئەگەر هەژاران داوای خوێندن و

پێشەوا حەسەنی بەسری دەڵێت: ((من و عیمرانی کوڕی حوصەین ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ بەیەکەوە بەڕێدا دەڕۆشتین دەستی یەکترمان گرتبوو، تێپەڕین بەلای سواڵکەرێکدا قورئانی دەخوێند، عیمران ڕای گرتم و، وتی: بوەستە گوێ لە قورئان بگرین، کاتێك کابرا تەواو بوو لە خوێندنەکەی داوای پارەی کرد، عیمران پێی وت: برا وەرە لەگەڵمان، بەڕاستی من لە پێغەمبەری خودام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((إِقْرَؤُوا الْقرآنَ و سَلوا الله ـ تَبارَكَ وَتَعالى ـ بِهِ[42]، فإِنَّ مِنْ بَعْدِكُم قَوْماً يَقْرَؤُنَ

---

پێش نوێژی لێبکەن، ئەوە زۆر لەسەری قورسە و بەدەگمەن وەڵامیان دەداتەوە، لەبەرئەوەی دەست کورت و کەم دەرامەتن، کۆتا ڕەوشتیان ئەوەیە لەهەرکوێ دونیا هەبێت ئەوانە لەوێن و چاویان لەوێ یە)). {أخلاق حملة القرآن ـ ص٣٢}.

[42] موبارکفوری ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێت: ((مەبەست لەوە ئەوەیە کە ئەگەر قورئان خوێن تێپەڕی بەئایەتی ڕەحمەتدا داوای ئەو ڕەحمەتە لەزاتی ئەڵڵا بکات، وە ئەگەر بەئایەتی سزادا تێپەڕی، پێویستە پەنا بگرێت بەزاتی ئەڵڵا لەو سزایە، هەروەها مەبەست لێی ئەوەیە کە لەدوای هەر خوێندنەوە و دەورکردنەوەیەك بەنزاکانی پێغەمبەر و هاوەڵان لەخودا بپاڕێتەوە، وە پێویستە نزاکانی بۆکاروباری دواڕۆژ و، چاکبوونی کاروباری موسڵمانان بێت لە ژیان و دواڕۆژیاندا)). {تحفة الأحوذي ـ ١٨٩/٨}.

القُرآنَ، يَسْأَلُونَ النَّاسَ بِهِ[٤٣]))((رواه: الامام أحمد في المسند ٤٣٦/٤، والترمذي في سننه ص٢٩١٧، وصححه الشيخ الألباني ـ رحمة الله ـ} .

واته: قورئان بخوێننەوە و پێی داوای ڕەحمەت و ئاتاجیەکانتان لەخودا بکەن، هەر بەو قورئانە پەنای پێ بگرن لە شەڕ و خراپەکان، بەڕاستی لەدوایی کەسانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێننەوە و، بەو قورئان خوێندنەوەیان داوا لە خەڵکی دەکەن.

بە ویستی خودا تەواوبووم لەم کارەم

لە ٢٠١٦/١٢/٥ دا

لەسلێمانی/ یاڵەکەی خەبات.

---

٤٣ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ هاتووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((تَعَلَّموا القُرآنَ، وَسَلُوا اللهَ بِهِ الجَنَّةَ قَبْلَ أنْ يَتَعَلَّمَهُ قَومٌ يَسْألونَ بِهِ الدُّنيا، فَإنَّ القُرآنَ يَتَعَلَّمَهُ ثَلاثَةُ نَفَرٍ: رَجُلٌ يُباهي بِهِ، و رَجُلٌ يَستَأْكِلُ بِهِ، وَرَجُلٌ يَقْرَأهُ لله)){رواه البيهقي في ((شعب الإيمان ـ ٢٦٣٠))، وصححه الشيخ الألباني ـ رحمه الله ـ في ((السلسلة الصحيحة ـ ٢٥٨)).

واته: قورئان فێرببن و، پێی داوای بەهەشت بکەن لەخودا، پێش ئەوەی کەسانێك فێری ببن و پێی داوای دونیا بکەن، بەڕاستی قورئان سێ کەس فێری دەبێت: کەسێك خۆی پێوە دەنوێنێت و فیزی پێوە دەکات، کەسێکی تر نانی پێوە دەخوات و کاسبی پێوەدەکات، کەسی سێ یەم تەنها و تەنها بۆ خودا فێری دەبێت و دەیخوێنێت.